## خانای قوبادی

قەدیم موتلـــەق، قەدیم موتلەق
یا قایم بەزات قەدیم موتلـــەق
حەیی بێ زەوال قەییووم بەرحەق
نگارەندەی نەقش نۆتاق ئەزرەق
لا مەوت بێ شەریک بینای بێمانەند
یەکتای بێ نەزیر بێخوێش وپەیوەند
مونشی رەقەم سەنج ئینشای شادوشەوق
بێ پەروا جەتەعن گورۆی تەحت وفەوق
بەخشندەی موراد ،بێ باک جەتانە
نازکێش زومرەی خوێش وبێگانە
بەوبەشق زاتت بێحەد سیفاتەن
باعیس ئیجاد کول مومکیناتەن
باجەتی دەروون شەو زیندەداران
بەتاعەت پاک تاعەت گوزاران
بەندەی کەمتەرین مەعسیەت بارەن
فریفتەی شەیتان شووم بەدکارەن
بالوتف و فەزلت بۆوە دەسگیرم
بویەر نە گونام ساحەب تەقسیرم
تا (یوم الممات )نگەهداریم کەر
عەلاج زامان شەرمەساریم کەر
مەگەرهەم بەلوتف چون تۆ رەحیمێ
(عەمیم الاحسان) ئیحسان عەمیمێ
مازۆ بدرێو نە عالەم پەردەش
بویەرۆ نەکار کەردەی ناکەردەش
وەرنە بەزاتت جەلای زاتتۆ
مەکەروون رۆی حەشر من شکاتتۆ
یاحەی کەس چون تۆ پەرێ کەس نیەن
چون تۆنە عالەم فریادرەس نیەن .

لوتفت بێ شومار عەفوت عەزیمەن
رەحمەتت بێشۆ عەتات عەمیمەن
بی میسل وشەریک ، تاک وتەنیانی
نگارندەی نەقشدار دنیانی
رەحمەت و بەخشش خەتمەن بەنامت
سەرسامەن شاهان عالەم ج سامت
قاهیران دەور جەقەهرت ماتەن
بەلێ راس ماچان جەکێ پەرواتەن
عەفوت جای ئومید بێگانە وخوێشەن
لوتفت دڵنەواز گەدا و دەروێشەن
ئیستدعام ئێدن لاشەریک پاک
بەشق شای ئەورەنگ (وما ارسلناک)
جەعەرسەی مەحشەر مەکەرتەرێقم
بەلوتف مەحزت بدەر تەوفێقم
زبانم بەزیکوتۆ نەبۆ خامۆش
نامت با جەلام نەبۆ فەرامۆش
یارەب ئامانەن بویەر جە گونام
غەیر جەتۆ نیەن مەلجەء و پەنام
چون من گوناکار خیلاف کردارێ
چون تۆ بەخشندە وهەم رەحمدارێ
چون من خەجلەت بار شەرعوتەریقەت
چون تو صاحێب رەحم بانی حەقیقەت
چون من نافەرمان ئالوودەی هەوەس
چون تۆپادشای فەردوفریادرەس
ببەخشە گونام بەخشندەی داوەر
بۆهەر دوودنیا فریادرەسیم کەر
وەرنە بەزاتت جەلای زاتتۆ
مەکەروون رۆی حەشرمن شکاتتۆ

# مناجات

## خانای قوبادی

قەدیم موتلەق، قەدیم موتلەق
یا قایم بەزات قەدیم موتلەق
حەیی بێ زەواڵ قەییووم بەرحەق
نگارەندەی نەقش نۆتاق ئەزرەق
لا مەوت بێ شەریک بینای بێمانەند
یەکتای بێ نەزیر بێخوێش وپەیوەند
مونشی رەقەم سەنج ئینشای دیوشەوق
بێ پەروا جەتەعن گوروی تەحت وفەوق
بەخشندەی موراد ،بێ باک جەتانە
نازکێش زومرەی خوێش وبێگانە
بەوبەشق زاتت بێحەد سیفاتەن
باعیس ئیجاد کول مومکیناتەن
باجەتی دەروون شەو زیندەداران
بەتاعەت پاک تاعەت گوزاران
بەندەی کەمتەرین مەعسیەت بارەن
فریفتەی شەیتان شووم بەدکارەن
بالوتف و فەزڵت بۆوە دەسگیرم
بویەر نە گونام ساحەب تەقسیرم
تا (یوم الممات )نگەهدا ریم کەر
عەلاج زامان شەرمەساریم کەر
مەگەرهەم بەلوتف چون تۆ رەحیمێ
(عەمیم الاحسان) ئیحسان عەمیمێ
مازۆ بدرێو نە عالەم پەردەش
بویەرۆ نەکار کەردەی ناکەردەش
وەرنە بەزاتت جەلای زاتتۆ
مەکەروون رۆی حەشر من شکات تۆ
یاحەی کەس چون تۆ پەرێ کەس نیەن
چون تۆنە عالەم فریادرەس نیەن .

لوتفت بێ شومار عەفوت عەزیمەن
رەحمەتت بێشۆ عەتات عەمیمەن
بی میسل وشەریک ، تاک وتەنیانی
نگارندەی نەقش دار دنیانی
رەحمەت و بەخشش خەتمەن بەنامت
سەرسامەن شاهان عالەم ج سامت
قاهیران دەور جەقەهرت ماتەن
بەڵێ راس ماچان جەکێ پەرواتەن
عەفوت جای ئومید بێگانە وخوێشەن
لوتفت دڵنەواز گەدا و دەروێشەن
ئیستدعام ئێدن لاشەریک پاک
بەشق شای ئەورەنگ (وما ارسلناک)
جەعەرسەی مەحشەر مەکەرتەرێقم
بەلوتف مەحزت بدەر تەوفێقم
زبانم بەزیکرتۆ نەبۆ خامۆش
نامت با جەلام نەبۆ فەرامۆش
یارەب ئامانەن بویەر جە گونام
غەیر جەتۆ نیەن مەلجەء و پەنام
چون من گوناکار خیلاف کردارێ
چون تۆ بەخشندە وهەم رەحمدارێ
چون من خەجڵەت بارشەرعوتەریقەت
چون تو صاحێب رەحم بانی حەقیقەت
چون من نافەرمان ئالوودەی هەوەس
چون تۆپادشای فەردوفریادرەس
ببەخشە گونام بە خشندەی داوەر
بۆهەر دوودنیا فریادرەسیم کەر
وەرنە بەزاتت جەلای زاتتۆ
مەکەروون رۆی حەشرمن شکاتتۆ

# نێوەرۆک



وێنەی رووبەرگ:

میعماری سنە

وێنەی پشت بەرگ:

نامەی حەزرەتی محەممەد (د.خ)

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

سروە

ناونیشان: ارومیه ـ چهارراه دانش ـ جنب ژاندارمری ـ مرکز نشرفرهنگ وادبیات کردی: انتشارات صلاح الدین ایوبی.

تلفن ٣٥٨٠٠

چاپ: از شرکت ایرانچاپ

تلفن: ٣٢٨١


## سەروتار

سلاو لە خوێنەرانی بەڕێز:

لەژمارەی پێشوودا کە باسی دەروەستی قەلەم کراویەکێک لە تایبەتی یەکانی قەلەمی دەروەستمان بەناوی (بەدی هێنانی بەرپرسی) شی کردەوە. ئێستاش هەر ئەم باسە درێژە دەدەین.

بەو هیوایە لاوە قەلەم بەدەستەکانمان ئەوەندەی لە توانایاندایە حەول بدەن بۆئەوە "هەستی بەرپرسی" لە نێو خەلکدا پتەوتر بکەن ولە نسکۆبردن وڕێ هەتلە بوون بپارێزرێن وهەر وەک لە رابردوودا دیتوومانە تووشی لاڕێیی نەبن.

لەبیرمانە لە زەمانی دەستەلاتداری تاغووت ورژێمی ستەمشاییدا لە لایەن رێکخراو وبنکە بە روالەت فەرهەنگی وهونەری وتەبلیغی وتەنانەت ئامووزشی یەکانیش بەرنامە ـ یەک داڕێژرابوو کە مەبەستی خافلاندنی چینەکانی کۆمەل بە تایبەتی چینی بەورەو وزەی لاو بوو، تا لە ئاست چارە نووسی سیاسی و کۆمەلایەتی وئابووری خۆیان کەمتەرخەم بن.

ئەودەم ئیستکباری جیهانی بەرنامەی دادەڕشت و شای

# نێوەرۆک



وێنەی رووبەرگ:

میعماری سنە

وێنەی پشت بەرگ:

نامەی حەزرەتی محەممەد (د.خ)

گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

سروە

ناونیشان: ارومیە ـ چهارراە دانش ـ جنب ژاندارمری ـ مرکز نشرفرهنگ وادبیات کردی : انتشارات صلاح الدین ایوبی .

تلفن ٢٥٨٠٠

چاپ: از شرکت ایرانچاپ
تلفن: ٣٢٨١


## سەروتار

سلاو لە خوێنەرانی بەڕێز :

لەژمارەی‌پێشوودا کە باسی دەرووەستی قەلّەم کراویەکێک لە تایبەتی‌یەکانی قەلّەمی دەرووەستمان بەناوی ( بەدی هێنانی بەرپرسی) شی کردەوە . ئێستاش‌هەر ئەم باسە درێژە دەدەین.

بەو هیوایە لاوە قەلّەم بە دەستەکانمان ئەوەندەی لە توانایاندایە حەول بدەن بۆئەوە " هەستی‌بەرپرسی" لە نێو خەلّکدا پتەوتر بکەن ولە نسکۆبردن وڕێ هەتلّە بوون بپارێزرێن وهەر وەک لە رابردوودا دیتوومانە تووشی لاڕێیی نەبن .

لەبیرمانە لە زەمانی دەستەلاّتداری تاغووت‌ورژێمی ستەمشاییدا لە لایەن ڕێکخراو وبنکە بە روالّەت فەرهەنگی وهونەری وتەبلیغی وتەنانەت ئامووزشی یەکانیش بەرنامە ـ یەک داڕێژرابوو کە مەبەستی خافلاّندنی چینەکانی کۆمەلّ بە تایبەتی چینی بەورەو وزەی لاو بوو ،تا لە ئاست‌چارە نووسی سیاسی و کۆمەلاّیەتی وئابووری خۆیان کەمتەرخەم بن .

ئەودەم ئیستکباری جیهانی بەرنامەی دادەڕشت و شای

غەیان کە گوێ لەمستی ئەوبوو ئەو بەرنامانەی لە هەموو ڕێکخراو و بنکەکانی وڵاتدا بەڕێوە دەبرد. جالەم ڕێبازەشدا پووڵ وپارەیەکی زۆری خەرج دەکرد. لەوبەرنامەدا ئەهەمیەتێکی تایبەتی بۆ قەڵەم بەدەستدیاری کرابوو، شوێنی لە سەر نووسراوەی کۆمەڵایەتی وهونەری و ...... ئەوان دانابوو.

جالەم نووسراوانەدا ئەوەی نەبوو بایەخی ئینسانی وئەخلاقی و وریا بوونەوەی تاکی وگشتی،هەڵسەنگاندن و رەخنەی وردبینانەلە ڕووداوەکان بوو.

هەر کە شۆرشی ئیسلامی دەستی پێکرد لێمشتی تێگەیشتن ووشیاری خەڵک بووبە کۆسپی رەگ ئاژۆکردنی ئەم دارە بێ فەڕە (ئەگەرچی بە تەواوی لەریشە دەرنەهات) سەرەرای هێندێک لادان و سەرەڕۆیی قەڵەم لە لایەن ئەوانەوە کە شۆڕش زەبری لێدابوون و بە ئەنقەستیا لە بەر نەزانی و کەمزانستی وتێکوشانی ئەوانەی لە بنەوەبڕی یان ڕەچاو دەکرد قەڵەم ڕێبازی ڕاستی خۆی گرتەوە بەر.

بەڵام چونکە هۆیەکانی "فاعلیت" و"قابلیت" بە تەواوی بنەبڕ نەکرا دیسان هەڵەسوونی هێناوە و بوو بە بیانووی دوژمن.سەر لە نوێ حەولەوەلای کۆڕ و دەستەی سەربە دنیا خۆڕانمان دیتەوە کە بۆ بووژاندنەوەی فەرهەنگی وابەستە وبارهێنانی نەسلێکی بێ خەبەر وئاگا لە خۆبڕاو، نەسلێک کە خۆ بە کەم بزانێ و زوو بەردەست بێ وبیروباوەری خۆی بدۆڕێنێ تێکوشان.

جالەم ڕێگایەدا مەیل و هەوا و هەوەسی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەرووی بۆ ئەوان کردووە وڕێگای بۆخۆش کردن.

ئێستا بەم پێ ودانە قەڵەم بەدەستدەبێ وریا و لێزان وتێگەیشتووبێ. بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکی مێژوویی خۆی بەجێ بێنێ و بەرسینگە لە نائەهلان ببڕێتەوە.

قەڵەم بەدەستەوە گرتن ونووسین زۆر هاسانە ئەوەی هەوێنی ئیمتیازە بەرهەم و رادەی ڕێبەری وڕێنوێنی قەڵەمە.

بۆیە دەبێ بۆ ناساندنی ئەو محەکە قوڵی هیممەتهەڵ بکەین وچاک وخراپ لێک هەڵاوێرین.

مەسەلەی بەدی هێنانی هەستی بەرپرسی کەلەژمارەکانی پێشوودا باسمان کرد حەربەیەکە بۆ پێشگرتنی لافاوی ماڵ وێران کەری خۆنەناسینی، کە جیهانی ئیستکبار وئیلحاد بۆ کۆت وسندم کردنی چەوساوەکان بەکاری دێنێ.

لەم بابەتەوە زۆر دوایین ئێستا وەختی ئەوە هاتووە کە ڕێگەی کردەوە پێشان بدەین.

**هەوەڵ شەرت واقیع خوازی یە**

هەر جووڵانەوەیەکی بەرپرسانە پێویستە واقیع خوازانەش بێ. جووڵانەوە بێ ئەوەی ڕاستیمان لەبەرچاوبێ کوێرانە وخیاڵپەردازانەیە و بەرپرسی تێدا نیە لەبەرئەوە نووسەری دەروەست دەبێ واقیعیەت ئاشکرا بکاوپەردەی ئیبهام و غەفڵەت لە بەرچاوی خەڵک لابدا. ئەوەش وەختێک دەلوێ کە نووسەر خۆی واقیع خوازبێ.

**بەراوردی (حەقیقەت) و (واقیعیت)**

ئەوەی لەبەرچاوە واقیعیەتە وئەوەی دەبێ هەبێ حەقیقەتە لەپاش ئەمفەرزەدەکرێ بڵێین مەبەستی ئێمە لە واقیعیەت خوازی حەقیقەتخوازی یە.

ئێستا بۆ ئەوەی ئێمە حەقیقەتخوازبین چەند شتمان پێویستە:

یەکەم ناسینی حەقیقەت و ناساندنی بە خەڵک. دووهەمی شی کردنەوەی واقیعیەت و هەڵسەنگاندن ورەخنەلێگرتنی لە هەموو بارێکەوە. سێهەم لەبەر یەک رانانی ئەم دوومەبەستە وپێک گرتنیان بۆ ئەوە لە ڕێگای واقیعیەتەوە بە حەقیقەت بگەین.

دەبێ زۆر وریا بین کە پێ داگرتن لەسەر بەعەزە واقیعێتیک نەبێتە هۆی دوور

غەیان کە گوێ لەمستی ئەوبوو ئەو بەرنامانەی لە هەموو ڕێکخراو و بنکەکانی ولاتدا بەڕێوە دەبرد. جالەم ڕێبا-زەشدا پوولّ وپارەیەکی زۆری خەرج دەکرد .لەوبەرنامەدا ئەهەمیەتێکی تایبەتی بۆ قەڵەم بەدەستدیاری کرابوو، شوێنی لە سەر نووسراوەی کۆمەڵایەتی وهونەری و ...... ئەوان دانابوو.

جالەم نووسراوانەدا ئەوەی نەبوو بایەخی ئینسانی وئەخلاقی و وریا بوونەوەی تاکی وگشتی،هەڵسەنگاندن و ڕەخنەی وردبینانەلە رووداـ وەکان بوو.

هەر کە شۆرشی ئیسلامی دەستی پێکرد لێمشتی تێگەـ یشتن ووشیاری خەڵک بووبە کۆسپی ڕەگ ئاژۆکردنی ئەم دارە بێ فەڕە (ئەگەرچی بە تەواوی لەریشە دەرنەهات) سەرەرای هێندێک لادان و سەرەڕۆیی قەڵەم لە لایەن ئەوانەوە کە شۆرش زەبری لێدابوون و بە ئەنقەست یا لە بەر نەزانی و کەمزانستی وتێکوشانی ئەوانەی لە بنەوەبڕی یان ڕەچاو دەکرد قەڵەم ڕێبازی ڕاستی خۆی گرتەوە بەر.

بەڵام چونکە هۆیەکانی "فاعلیت"و"قابلیت" بە تەواوی بنەبڕ نەکرا دیسان هەڵسوونی هێناوە و بوو بە بیانووی دوژمن.سەر لە نوێ حەولەوەلای کۆڕ و دەستەی سەربە دنیا خۆزانمان دیتەوە کە بۆ بووژاندنەوەی فەرهەـ نگی وابەستە وبارهێنانی نەسلێکی بێ خەبەر وئاگا لە خۆبراو، نەسلێک کە خۆ بە کەم بزانێ و زوو بەردەست بێ وبیروباوەڕی خۆی بدۆڕێنێ تێکوشان .

جالەم ڕێگایەدا مەیل و هەواو هەوەسی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەرووی بۆ ئەوان کردووە وڕێگای بۆخۆش کردن .

ئێستا بەم پێ ودانە قەڵەم بەدەستدەبێ وریا و لێزان وتێگەیشتووبێ . بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکی مێژوویی خۆی بەجێ بێنێ و بەرسینگە لە نائەهلان ببڕێتەوە.

قەڵەم بەدەستەوە گرتن ونووسین زۆر هاسانە ئەوەی هەوێنی ئیمتیازە بەرهەم و رادەی ڕێبەری وڕێنوێنی قەڵەمە .

بۆیە دەبێ بۆ ناساندنی ئەو محەکە قوڵی هیممەت هەڵ بکەین وچاک وخراپ لێک هەڵاوێرین .

مەسەلەی بەدی هێنانی هەستی بەرپرسی کەلەژمارەکانی پێشوودا باسمان کرد حەربەـ یەکە بۆ پێشگرتنی لافاوی ماڵ وێرانکەری خۆنەناسینی، کە جیهانی ئیستکبار وئیلحاد بۆ کوێت وسندم کردنی چەوساوەکان بەکاری دێنێ .

لەم بابەتەوە زۆر دواین ئێستا وەختی ئەوە هاتووە کە ڕێگەی کردەوە پێشان بدەین .

**هەوەڵ شەرت واقیع خوازی یە**

هەر جووڵانەوەیەکی بەرپرسانە پێویستە واقیع خوازانەش بێ . جووڵانەوە بێ ئەوەی ڕاستیمان لەبەرچاوبێ کوێرانە وخیاڵپەردازانەیە و بەرپرسی تێدا نیە لەبەرئەوە نووسەری دەروەستدەبێ واقیعیەت ئاشکرا بکاوپەردەی ئیبهام و غەفڵەت لە بەرچاوی خەڵک لابدا . ئەوەش وەختێک دەلوێ کە نووسەر خۆی واقیع خوازبێ .

**بەراوردی (حەقیقەت) و (واقیعیت)**

ئەوەی لەبەرچاوە واقیعیەتە وئەوەی دەبێ هەبێ حەقیقەتە لەپاش ئەمفەرزەدەکرێ بڵێین مەبەستی ئێمە لە واقیعیەت خوازی حەقیقەت خوازییە .

ئێستا بۆ ئەوەی ئێمە حەقیقەت خوازبین چەند شتمان پێویستە:

یەکەم ناسینی حەقیقەت و ناساندنی بە خەڵک . دووهەم شی کردنەوەی واقیعیەت و هەڵسەنگاندن ورەخنەلێگرتنی لە هەموو بارێکەوە. سێهەم لەبەر یەک رانانی ئەم دوومەبەستە وپێک گرتنیان بۆ ئەوە لە رێگای واقیعیتەـ وە بە حەقیقەت بگەین .

دەبێ زۆر وریا بین کە پێ داگرتن لەسەر بەعەزە واقیعێتیک نەبێتە هۆی دوور

بوونەوە لە حەقیقەت یا لە گەڵ هێندێک مەوزووع رێک بکەوین وحەقیقەت فیدا بکەین. جا ئەوە ئەزموونێکی سەختە کەزۆرکەس لێی رەددەبنەوە

**وریاکردنەوە ومزگێنی پێدان**

دەبێ خوێنەر لە باسێکی مەنتیقی وموستەدەلدا راست ورەوان یا بە ئیشارەوکینایە (بە پێی هەل ومەرج) لە زەرِ و زیان ومەترسی یان ئاگادار بکرێ ولە ئاقیبەتی بەدەوام، بوونی واقیعەتێکی مەنفی لە کۆمەڵدا، ئاگادار بکرێ دەنا هیچ چەشنە جموجووڵ و جووڵانەوەیەک بۆ گۆڕینی بنەرەتی وتەنانەت رواڵەتیش پێک نایە .

هەر وشیارکردنەوەیەک (ئەگەر زۆریش پێویست بێ ) رەنگە تەئسیرێکی پێچەوانەی هەبێ وببێتە هۆی ناهومێدی ولەنێوبردنی مەبەست . ئەوە بۆخۆی زۆر گرینگە . بۆ ئەوە تووشی وەها مەسەلەیەک نەیەین (کەبەداخەوە زۆر لە دەورانی مێژووی وڵاتی ئێمەدا بۆتە هۆی دەخەوکردن و بەستنەوەی بیر ولە ئاکامدا لەنێو چوون) دەبێ لەقەدەر هەل ومەرجی زەمان ومەکان رادەی سەلماندنی گوێدێر مەترسی ئاشکرا بکرێن تا لە لایەک وشیاری بکاتەوە و لە لایەکی ترەوە هەستی بەرەنگاری تێدا بخوڵقێنێ .

وەختێک ئەم مەبەستەوەدی دێ کە لە رەوانناسی تاکی و کۆمەڵایەتی کەلک وەربگرین وباوەڕمان بەخۆبێ وبزانین تا چ رادەیەک شوێن لە سەر گوێدێر دادەنێ . جا ئەو دەم وردە وردە ئەوان بۆ ئەم خەباتە ئینسانی یە تەیار بکەین .

ئەگەر ئاورێک وەزەمانی پێش شۆڕش بدەین وەبیرمان دێتەوە کە بڕوابە "بێ سەمەر بوونی بەربەرەکانی لەگەڵ داموودەزگای پڕدەستەودەیارەی پەهلەوی وژاندرمەی ناوچە و تێکدانی ئەونیزامە" تا چ رادەیەک ببووە هۆی کش و مات بوونی کۆمەڵ .پاشان دیتمان کاتێک وزەی بەربەرە- کانی وتێکۆشان کەوتە گیان و لەشی خەڵکەوە چ ئاڵ وگۆڕێکی گەورە پێک هات .ئێستا پێویستە لەکاری وشیارکردنە- وەی کۆمەڵدا زۆر وریا بین تا ئەوەندەی پێویستە خەڵک دنە بدەین ونەیەڵین تووشی سستی وداهێزان بێ.بۆ ئەم کارە دەبێ مزگێنیوەدی هاتنی ئەو ئامانج وئاواتە پیرۆزانەی رووحی ئینسانیان پێ دەگەشێتەوە بدەین . بەم جۆرە هیواوهومێد بخەینە دڵی چین وتوێژەکانی کۆمەڵ تابۆ بەجێ هێنانی ئەرکی خۆیان ئامادە بن . سەرکەوتن لەم کارەدا بەستەیە بە نیشاندانی ئەو دیاردە جوان ودزێوانەی لە گۆڕێن و روون کردنەوەی زەینی ئەو خەڵکەی کە بۆیان دەنووسین .

لەزۆر رێبازاندا پێویستە پێشەکی کارێکی گرینگی دیکەش بکەین .ئەویش ئەوەیە کە پەیوەندی رووحی وکۆمەڵا- یەتی وئابووری و سیاسی کومەڵ لەگەڵ ئەو دیاردە دزێوانە کە لە گۆڕێدان بپسێ .ئەو کارەش پێویستی بەلێک دانەوەیەکی دروستی هەل ومەرج وناسینی دروستی شەخسی یەتی ئینسانە .

ئەم مەتڵەبە گرینگترین هۆیە بۆشکان وبەزینی ملهوڕەکانی رۆژهەڵات ورۆژئاوا کە لەبەر شەپۆلی بەهێزی ئەم خەڵکە راوەستاون .

**درێژەی هەیە**

---

بسم الله الرحمن الرحیم

## «سرمقاله»

باسلام بەخوانندگان عزیز

در شماره قبل در ادامه بحث تعهد قلم به یکی از ویژگیهای قلم متعهد تحت عنوان مسئولیت آفرینی پرداختیم .

اینک در ادامه بحث ویژگیهای مکمل "مسئولیت آفرینی" را نیز موردبحث قرار میدهیم باشد تا قلم بدستان جوان و

**برواننەلاپەرەی ٩٢**

# هێمن: ئومێدوارم ئەم سروەیە هەربژێ وهەردڵان بووژێنێتەوە وهەرگوڵان بگەشێنێتەوە وهەردڵی کوردان خۆش بکا

## ڕێبازی سروە

قازی ئەحمەد

زستانی ساڵی ٦٣ی هەتاوی لە هەموو کوردستان بووبە دەنگۆ کە مامۆستا هێمن خەریکە گۆوارێکی کوردی دەربکا . ئەم هەواڵە زۆرزوو دەولاتگەڕا وسەرنجی خەڵکی کوردستانی ڕاکێشا وهەموو چاوەڕوان بووین :

**ئاخۆ بڵێی ئەوشا سوارە پیرە بتوانێ بەنێو ئەو هەموو کەندوکۆسپەدا ڕێ ببڕێ وڕێگا یەک بۆوەڕێ خستنی کاروانی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی بکاتەوە ؟**

بەهاری ٦٤یش مان بەو تامەزرۆیی یەوە دەستپێکرد سەرەنجام "سروە"ی هێمن لە سەرەتای هاویندا گەیشتە دەستمان وفێنکایی ختسە دڵمانەوە .بڵاوبوونەوەی سروەشاعیرگوتەنی "تەنینەوەی وەکوو بۆنی گوڵاڵەئانی بوو"لەهەموو شار و گوندی وڵات باس باسی "سروە" وهێمن بوو.

"سروە" هەر لە سەرەتای لەدایک بوونیڕا جوان و پوخت وپاراو بوو. هەر واژە و ڕستەیەکی نەخشی هێمنی پێوە دیاربوو .ناسک خەیاڵی شاعیرانە وشێوەی ساکاری پەخشان نووسینی هێمن وەک سەرچاوەی زوڵاڵی ئاوی کانیاوی کوێستان مێرگی سەرسەوزی "سروە"ی بە هەزار چەشنە جوانی ڕازاندبۆوە .

هێمنی بەئەزموونی دنیا دیتە چوارچێوەی کاری گۆواری "سروە"ی خەستە بەستێنی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی یەوە **وڕێبازێکی وەهای گرتەبەر کە نە دوژمن توانی ڕەخنەی لێ بگرێ ونەدۆست توانی ڕێزی لێ نەگرێ .** شاعیری فەرزانەی (فرەزانی) کورد ئەوەی بۆروون ببۆوە کە هەر فەرهەنگە نامرێ .

تا ئەمڕۆ لە کوردستانی ئێمەدا زۆرجار ڕۆژنامە وگۆوار وکتێبی کوردی بڵاو کراونەوە کە بە پێی خول و سووڕی زەمان لە خزمەت بیرو باوەڕی تایبەتی خۆیاندا بوون وهەرگیز تا ئێستا ڕۆژنامە یا گۆوارێکی کە ڕاستەوخۆ خزمەتی فەرهەنگ وئەدەبی کورد بکا بڵاو نەبۆتەوە .هێمن بە بڵاوکردنەوەی "سروە" گەمارۆی پتەوی قەڵای فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی شکاند و هەل ومەرجی بەهرەوەرگرتنی لەم گەنجینە بێ وێنەیە بۆ هەموومان پێک هێنا .باوەکوو ئەم پاڵەوانە بە ئەزموونە وەک ئارەشی کەواندار گیانی خۆی لەسەر ئەم کارە دانا ، بەڵام هەرێمی دەستەڵاتداری فەرهەنگی نەتەوەکەی فرەوان ترکردەوە وگەیشتە ڕێزی پیاوانی نەمری مێژوو.

فەرهەنگی کوردبە درێژا-

یی مێژوو ،بە تایبەتی لەم دوو سەدەی دواییدا کەوتە ژێر هێرشی بێ وچانی دوژمنانی مرۆڤایەتی و ئازادی .ئەم گەنجینە دەو-لەمەندە یا داگیردەکرا یا شاردرایەوە تائەو ئینسانەی کە کوردی پێدەڵێن تووشی پووکی وکلۆری وهەستی "خۆبەکەمزانین" بێ و لە ئاکامدا بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی گیان ودەروون تێ بکۆشێ فەرهەنگی بێگانە ئەویش لایەنە پووچەڵەکانی لە مێشکی خۆی باخنێ و باوەڕی بەخۆی نەمێنێ .

ڕێبازی سروە بێ کەم و زیاد ،بێ پێچەڵاگوتن ،بەربە-ندێکی پتەوە کە ڕێگا لە بێزلەخۆکردن و لەبەربێگانە پاڕانەوە وچاودەفەرهەنگی بێگانەبڕین دەگرێ و دەمانگێڕێتەوە سەرفەرهەنگ و ئەدەبی ڕەسەنی خۆمان . ڕووناک بیری کورد کاتێک لە سروەدا بەیتی "سوارۆ"و "سەیدەوان"و"کاکەمیرو کاکە شێخ" دەخوێنێتەوە ڕەنگە لەوباوەرە دەست هەڵگرێ کە تراژدی "هاملێت" بەسۆزترین ڕووداوی دڵ سوتێنی ئەدەبی جیهانی بێ ووێنەی لە هیچ فەرهەنگ وئەدەبێکدا دەست نەکەوێ ا یا ئاگاداری لە ڕووداوی دمدم وبەسەرهاتی، خانی لەپ زێڕین ، تراژدی "قەیسەرو پۆمپە"ی لە بەرچاوی بخا وبێتەوەسەرخۆو بڵێ "گەلۆ! خۆ ئێمە ئەوە بووین ونەماندەزانی ! ".

"خۆبەکەمزانین"و"لەخۆ بێزاربوون"و"بێگانەبەزل زانین" نەخۆشی کۆمەڵایەتین کە زیاتر لەنێو کۆمەڵانی چەوساوەی گێتیدا پەرەدەگرێ ودەبێتە هۆی درێژە پەیدا کردنی دەسەڵاتداری داگیرکەر وژێردەستی و چەوسانەوەی خەڵکی زۆرلێکراو. یەکێک لە ڕێگا هەرە گرینگەکانی چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشی-یانە "گەڕانەوەسەرخۆ" یە و ئەوەش بەم ئاڵ و گۆڕە دەرونی یە دەگوترێ کە دەبێتە هۆی ڕاپەڕین و هۆشیاربوونەوە ودژی ناڕەوا ڕاوەستان " ڕێبازی سروە هەر لە سەرەتاوە ئەم ئاڵ و گۆڕەی لەنێو خوێنەران و کۆمەڵانی کوردستاندا پێک هێنا وسەرنجی لاوانی وڵاتی بۆدنیای بەرفرەوانی فەرهەنگ وئەدەبی کورد ڕاکێشا .

ئێستا تیراژی سروە خۆلە بیست هەزار دەدا کەزوربەی نووسراوەکانی لە لایەن خوێنەرانی بەڕێزەوە دەنێر-درێ.هەزاران نامە ونوسراوە وگوتار وبابەتی دیکەمان لەسەرانسەری کوردستان و وڵاتانی دەرەوە پێ دەگا . هەزاران دەستی پاڕانەوەو دوعا بەرەوئاسمانن کە ئەو کارە درێژەی بێ وتەگەرەی ، نەیەتە ڕێ .ئەم پێشوازی وهەڵوێستە گشتی یە ئەم ڕاستی یەمان بۆروون دەکا-تەوە کە "سروە" هەر لە هەوەڵ هەنگاوڕا بەرەوخەڵک ڕۆیشتووە و ئەرکی خزمەت بە فەرهەنگ وئەدەبی خەڵکی وەستۆگرتووە وکاتێک دیتوویەتی ئامێزی هەموانی بۆئاواڵەیە تێکۆشاوە هەنگاوی بەرەوخەڵک چوونی، بەرزتر باوێ .

پاش کۆچی دوایی مامۆستا هێمن ئێمە خۆمان ئامادەی تێکوشانێکی زۆرتر کردووە تا شوێنی بەرنەدەین و لە ڕێبازی لانەدەین . سوورین لەسەر ئەوە کەپلەی چلۆنا-یەتی بابەتە جۆراوجۆرەکانی گۆوار بەرزتر بکەینەوە . سروە دەبێ هەر وەک جاران تریبۆنی بیروڕای گشتی هەموو خەڵکی کوردستان بێ .

دیسان لەهەموخوێنەران ونووسەرانی خۆشەویستمان داوا دەکەین بە ناردنی نامە ونووسراوە وپێشنیار ورەخنە وچەشنە بابەتی دیکە یارمەتیمان بدەن تابتوانین بەسەر کەندو کۆسپی ڕێگادا زاڵ بین و"بەرەوئاسۆی ڕوون" هەنگاومان کرژتر بکەین . "خوا یاربێ "

# ح ره‌شیدی زه‌رزا

ساقیا جه‌رگم بڕا جه‌رگم بڕا
بێره لام به‌رگی هومێدم دادڕا

تۆ ده‌زانی بۆ په‌نام هێناوه بۆت
که‌س ده‌ها نام نایه ساقی غه‌یری خۆت

کانی خوێن وخوێ،دووچاوی سوێر من
کاغه‌زم کێلگه‌ن ،قه‌ڵه‌م ئاودێر من

من ئه‌له‌و شوێنه شه‌وارم کردووه
له‌و هه‌وارانه هه‌وارم کردووه

مل به مورووی شێعری پاراوو جوان
رۆژگارێ بۆم ده‌هاتنه جێ ژوان

هاوده‌می رۆژ و شه‌و ،کات وسه‌عات
دۆست وهاوڕێی سه‌رگوریشته‌وکاره‌سات

رێژنه‌باران وهه‌تاوی به‌ربه‌یان
قاسپه‌یی که‌و، شێعری "هێمن"نه‌ی شوان

دۆڵ وکێوو که‌ژ هه‌موو پێوار من
شه‌و خوناوه‌ی په‌لکی گوڵ دڵدار من

بولبولی خه‌مگین نه‌واخوانی منه
ئێش و برکی گه‌ل هه‌موو ژانی منه

ته‌یری سه‌رسه‌ختی که‌ژ و کێوم ئه‌من
کۆتری تیژباڵی نێو چێوم ئه‌من

ئاشقی ناڵه‌ی به سۆی خاسه‌که‌وم
ساتێ ده‌نگی وی نه‌بیسم ناسره‌وم

من له رۆژ بێزار وهاوده‌نگی شه‌وێم
بۆیه هه‌روا هه‌ڵوه‌دای ئێره‌وئه‌وێم

لێڕه‌وارو جه‌نگه‌ڵ وسه‌ر هه‌رد نه‌ما
زه‌رده و ماه وئه‌ستێره‌م وبن به‌رد نه‌ما

جێ نه‌ما سه‌ر لێ نه‌ده‌م رووی تێ نه‌که‌م
تا ورینگه‌ی تۆ هه‌ڵیگرت شوێنه‌که‌م

من به دووی ئه‌و ده‌نگه‌دا به‌ژنم له‌ری
خۆم ته‌کاندو دارێ بووم میوه‌م وه‌ری

تۆ بڵێی وشک بێته‌وه چاوی پرئاو
تۆ بڵێی راست بێته‌وه پشتی چه‌ماو

ئه‌و چریکه‌ی ئاسمانی تازه چوو
هاو زمانی بێ زمانی تازه چوو

ساقیا من نوقمی ده‌ریای مه‌ینه‌تم
زۆر گرانه باری داخ وحه‌سره‌تم

من به‌قه‌ت ئه‌و کێوه ده‌ردو ژانمه
ئێش وبرک و ده‌ردو کوڵ میوانمه

لێڵه ئاوی روونی چاوه‌ی کانی من
دوایی نایه ده‌ردی بێ ده‌رمانی من

چۆن نه‌ناڵم ،چۆن نه‌که‌م ئه‌و زامه‌هه‌ست
من هه‌وێنی گشت ئه‌وینمدا له‌ده‌ست

ئێسته گشت به‌رپاڵ و زه‌نوێر وزه‌مه‌ند
لێڕو ،دۆڵ و ،زێ وگۆمی قووڵ و مه‌ند

زه‌ردو هه‌ڵدێرو ته‌لان و لێڕه‌وار
چادروچیغ و ،شه‌وێن وجێ هه‌وار

چۆڵە بێ تۆ وەک هەواری خاڵی یە
"حاجی" خەمبار "نالی" ناڵەناڵی یە

هەرچی فرمێسک بوو هەر بۆ تۆ رژا
هێندە گریام نووری چاوم رۆ رژا

چاوی من ئیتر هەتەر ناکا لە رێ
کوا؟ لەکوێی؟تاپێم نیشاندەی راستەرێ

بێ هەدادانم شەووڕۆژ بۆمە بەست
هەورو هێڵ هات ڕۆژی روونی دام لە دەست

ئەوکەسەی سەختی لەبەر ئەستەم نەبوو
داوەڵی مەرگی بەلاوە خەم نەبوو

ئەو جیهانە بەرفرەی پێ تەنگە ئەو
چون بەبێ "هێمن" بەبێ ئاودەنگە ئەو

کۆچی ئەو هێڵی سنوورانی پەڕاند
چاوی کاڵیشی لەخەودا راپەڕاند

مل بە کوێنن گوڵشەن و گوڵزارەکان
پاکی رەش پۆشن هەموو دڵدارەکان

بەرگی سەوزی داڕنی داری بەری
گوڵ فرێیداوە لەسەر تاجی سەری

تازە شەوبۆ بۆنی جارانی نەما
تازە سەوزە رەنگی بارانی نەما

تازە ئاونگ شینکە ناکا ،جوان و تەڕ
گوڵ خوناوەی تازە نابارێ لەسەر

تازە شەوداوەت لە هیچ کوێ ناگەڕێ
پیاوی چابە ئەو هەڵەش بۆن داگەڕێ

گەر وړینگەی مەل بچێ بۆ ئاسمان
کەڕ بکا گوێچکەی زەوی تاکەهکەشان

گەر لە دۆڵێشدا بەکۆ دەنگ داتەوە
دەنگی هیچ مەل دەنگی تۆ ناداتەوە

دەستی من داوێنی تۆ هەست و خەیاڵ
دەربڕە سۆزو فغان و ناڵە ناڵ

بێرە هانام وبەرەو بەرزیم بەرە
بەڵکوو بەرزی دیاریدا ئەو گەوهەرە

بەرزەفڕ بۆ سەر سەرینچاوەی ئەوین
هەڵفڕین وهەڵفڕین وهەڵفڕین

وابە کڕنۆش روو بەرووگەی کێلی ئەو
هەڵدڕین جەرگی رموزنەی چەوتی شەو

سەر لەنوێ پەیمانمان نوێ کەینەوە
وەک فریزوو سەر لەبن هەڵدێنەوە

بەڵکوو تیشکی خۆر لە ئاسۆ بێتەدەر
ئەو جیهانە بەرفرەی بگرێتە بەر

تاوەکوو دەتوێمەوە ناڵێم بەسە
با نەڵێن "هێمن" هەژارو بێکەسە

# باسی ئەدەبی

دارا م

شێوە و ڕێبازە جۆربەجۆرەکانی ئەدەب، داهێنانی یەک یا چەند کەسێکی شارەزا و لێزان نین کە پەیدا بوونی فلانە ڕێباز بە بڵاوکراوەیەک ڕاگەیەنن و ڕێ و شوێن و ئوسوولەکانی لە گوێی خەڵکی خستن، شێوە و ڕێبازی ئەدەبی هەمیشە، بە شێوەیەکی شاردراوە یان ئاشکرا بووە، پەیدابوون و گەشەکردنی هەر ڕێبازێکی ئەدەبی پەیوەندی بە کات و شوێن ( زەمان و مەکان)ێکی تایبەتییەوە هەیە و چەندان هۆی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبنە هۆی زاڵ بوون و گەشەکردنی ڕێبازێکی ئەدەبی دیاری کراو بەسەر ئەوانی دیکەدا.

ئەگەر بمانەوێ لە ڕێبازی نوێی شێعر و ئەو قوناغەی ئەوڕۆ شێعری کوردی پێدا تێدەپەڕی بدوێین، باشتر وایە ئاورێکیش بۆ دوایێ بدەینەوە و شتێک لەبارەی ( قوتابخانە سەرەکییەکانی ئەدەب )ەوە بدوێین کە ئەمانەن:

**۱ ـ قوتابخانەی کلاسیزم :**

وشەی کلاسێک، بە مانای فراوانی خۆی، بەتەواوی ئەو بەرهەمە ئەدەبییانە دەگوترێ کە مایەی شانازی ئەدەبیاتی میللی گەلێکن. بۆ نموونە دەتوانین ئەو بەرهەمە زیندووانەی شاعیرە مەزنەکانمان بۆیان بەجێ هێشتووین بە کلاسیکی ئەدەبیاتی کوردی دابنێین، بەڵام کاتێک باس دێتەسەر قوتابخانە ئەدەبییەکان بەو قوتابخانەیە دەگوترێ کە بەر لە پەیدا-بوونی قوتابخانەکانی دیکەهاتووەتەکایەوە دیارە لە کاتێکدا قوتابخانەی کلاسیزم بە یەکەمین قوتابخانەی ئەدەبی دادەنرێ مانای ئەوە نیە کە پێش کلاسێزم هیچ شێوە و ڕێبازێکی ئەدەبی نەبوە، بەڵکوو هەروەک لە سەرەتادا گوتمان شێوە و ڕێبازی ئەدەبی هەمیشە بە شێوەیەکی شاردراوە یان ئاشکرا هەبوە، بەڵام پێش پەیدابوونی کلاسیزم هیچ کام لەو ڕێبازانە مایەی پەسەندی خاس و عام نەبوون تا بتوانن باڵا بەسەر ڕێبازەکانی دیکەدا بکێشن و بەرهەمی ئەدەبی سەردەمێکی دیاری کراو لە خۆیاندا کۆ بکەنەوە. بەڵام کلاسیزم و ئەو قوتابخانانەی دوای وی کە هەر لەم نووسینەدا ئیشارەیەکی کورتیان بۆ دەکەین هەر یەکەیان دەورەیەک لە مێژووی ئەدەبیاتدا پێک دێنن.

ماوەتەوە شوێن و کاتی پەیدا بوونی قوتابخانەی کلاسیزم بزانین: ناو و ئوسوول و تەفسیرەکانی کلاسیزم یەکەمین جار لە سەردەمی پازدە تا حەڤدەهەمی دەهەمی میلادی لە ئەورووپا سەری هەڵدا.بەڵام شاعێری کورد لەو سەردەمەدا کە ڕۆژنامە و ڕادیۆ و هاتوچۆ نەبووە، بێ ئاگابووە لە وەزع و حاڵی ئەدەبی ئورووپایی و لەناو چوار دیواری مزگەوت و حوجرەکەی دا نەزانیویەتی کلاسێک چییە و نە ئوسوول و ڕێ و شوێنەکانیشی بە شێوەیەکی دیاری کراو زانیوە، بەڵام ئەو قسەیەش ئەوە ناگەیەنێ کە شاعێری کورد هەروا ڕەمەکی شێعری گرتووە و کەس ئاگای لەکەس نەبووە، بەڵکوو عامیلی( کات

و شوێن) و باری ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەتی وولاتی ئێمەش چەند ئوسوول و رێ و شوێنی لەناو سەبکێکی دیاری کراودا کو کردەوە کە دەبایە شاعێری کورد پەێرەویان لێ بکا و هەر ئەو سەبکەشە کە پاشان بە قوتابخانەی کلاسیزمی شێعری کوردی دانرا کە گرنگ ترین ئوسوول و رێ و شوێنەکانی ئەمانەن :

١ ــ **پەیرەوی شاعێرانی پێشوو :** شاعێری کلاسێک باوەڕی وایە ئەو شێعرانەی پێش خۆی گوتراون بە سەبکێکی شایستە نووسراون ،بۆیە زیندوو ماونەوە جێگای رێز و ستایشن ، جا کەسێک کە بیەوێ بەرهەمەکەی ویش زیندوو بمێنێتەوە دەبێ رێ و شوێنی وان بگرێتە بەر کاتێک کە شێعری شاعێرە کۆنەکانمان دەخوێنینەوە دەبینین مەلای جەزیری چۆن عاشق دەبێ نالی و سالمیش هەر بەو جۆرە،یان دەبینین مەولەوی مەزن بەو هەموو خەیاڵ نازکیەی خۆیەوە شێعرەکانی بە ئاوی هەست و سۆزی بێسارانی و خالۆی کۆماسی ئاو دەدا و هەر وەک بۆ خۆی دەڵێ :

**بێسارانیەن نە تۆی فەردی مــن**
**خەم چەنی خەمان زومە بۆ ساکــن**

و یا دەڵێ :

**بولندکەر مەقام دلسۆزی راسی**
**نەزیلەش بۆ فەرد خالۆی کۆماسی**

بەڵام پێویستە لێرەدا بڵێین کە ئەو کارە بەلاسایی کردنەوە و چاولێ کردنی کوێرانە دانانرێ ، بەڵکوو هەر شاعێرەفەرزی تایبەتی خۆی هەیە و دەتوانێ شتی تازەتر بێنێتە کایەوە، یەکێک لە زانا کلاسیکیەکان دەڵێ : " هەموو شتێک گوتراوە بەڵام هیچ شتێک بە تەواوی دەرک نەکراوە" بۆیە دەڵێ راستیە ـ کان هەمیشە دووبارە بکرێنەوە.

٢ ــ **ئیلهام وەرگرتن لە سروشت :** سروشت سەرچاوەیەکی گرنگی ئیلهامی شێعرە و نەک تەنیا پەیرەوانی قوتابخانەی کلاسیزم ،بەڵکوو

پەیرەوانی تەواوی قوتابخانە و رێبازە ئەدەبیەکانیدیکەش هەریەک بە جۆرێک لەسەر ئەو باوەڕەن . بەڵام لە کلاسیزمدا روانین بۆ سروشت وەک دووربینی عەکاسی نیە هەرچی بێتە پێش چاوی شاعێر دەقاودەق وێنەکەی بکێشێ بەڵکوو لەنێو وێنە جەنجاڵەکانی سروشتدا هەر شتێک پیس و ناشیرین بێ وەلای دەنێ و جەوهەری هەر شتێکیش جوان و رازاوە بێ هەڵی دەبژێرێ .

٣ ــ **بەکارهێنانی عەقل :** لە ئەدەبی کلاسیکدا عەقڵ بریتیە لەهەر شتێک کە پێچەوانەی وەهم و خەیاڵ بێ ،کلاسیکیەکان دەڵێن دەبێ عەقڵ بەسەر هەست و نەستی ئینساندا زاڵ بێ چونکە عەقل گەورەترین نیشانەیە کە ئینسان لە ئاژەڵ جوێ دەکاتەوە. بەرهەمێک کە عەقڵی تێدا بەکار هاتبێ ئەوەیە کە ئەندیشەی ئینسانی بخاتە سەر رێ ـ رەوی راستی خۆی و سنوورێکی تایبەتی بۆ دابنێ .

٤ ــ **رووخساری جوان ولایەنی ئەخلاقی :** بە بڕوای پەیرەوانی کلاسیزم جوانی و رازاوەیی بۆ شێعر زۆر پێویستە ،دروست کردنی ئیستیعارە و جناس و بەلاغە وپەیداکردنی مەعنای وورد و رێک خستنی ووشە و دێڕە شێعرەکان بەدیقەت و بەکارهێنانی قافیەی قورس نرخی هەر شێعرێکی کلاسیکی زیاتر دەکەن ، لەم رووەوە نالی پیری شاعیرانی کوردە و تائێستا کەس نەیتوانیوە شان لە شانی بدا ،بەڵام بۆ تەواوکردنی هەر بەرهەمێکی ئەدەبی ئەوەندە بەس نیە ،بەڵکوو لە هەمان کاتدا دەبێ فێرکەر و خاوەن

ئەنجامێکی ئەخلاقی بێ ، بە گشتی پەیرەوانی کلاسیزم پێیان وایە کە هەر شیعرێک یان هەر دێرێک لەژێر رووخساری جوانی خۆیدا دەبێ لایەنێکی ئەخلاقیش هەبێ کە دەلیلی نووسینی ئەو شیعرە یان هەر بەرهەمێکی ئەدەبی دیکە نیشان بدا.

ئەمانە چەند ئەسڵ و قاعیدەی دیکەش بناغەی قوتابخانەی کلاسیزمن و شاعیری کلاسیزمن و شاعیری کلاسیک دەبێ پەیڕەویان لێ بکات و خۆی پێیانەوە ببەستێتەوە و ئەو شاعیرەی باشتر توانیبێتی ئەم رێ و شوێنانە لەبەر چاو بگرێ بەرهەمی جوانتری هێناوەتە کایەوە.

**٢ ـ قوتابخانەی رومانتیزم :**

سەرەتای سەدەی نوزدەهەم دەست پێکردنێکی نوێ بوو لە ئەدەبیاتی جیهاندا کەتائەوروش رەگ وریشەی هەرماوەتەوە. لەو سەدەیەدا ئاڵوگۆڕێکی زۆر لەروری سیاسی و ئابووری و کومەلایەتی‌یەوە بەسەر جیهاندا هات کە ئەو ئاڵ و گۆڕانە لە ئەدەبەکەشدا رەنگیان دایەوە و قوتابخانەیەکی نوێ بەنێوی رومانتیزم ، هاتە کایەوە کە بە واتای (خەیالاوی) یان (ئەفسانەیی) یان(شاعیرانە) بەکار دەهات. شایانی باسە ئەم قوتابخانەش هەروەک کلاسیزم یەکەم جار لە ئورووپاوە پەیدا بووە ، و سەرەتاکانی ئەم سەدەیە لەنێو ئەدەبی کوردیشدا سەری هەڵدا. ئەگەر بمانەوێ ئوسوول و رێ و شوێنەکانی ئەم قوتابخانەیە بزانین ، بێ گومان تووشی زەحمەتێکی زۆر دەبین ، چونکە رومانتیزم بە پێچەوانەی کلاسیزمەوە قوتابخانەیەکی یەکجار جەنجاڵ و تێکەڵ پێکەڵە و لەکاتێکدا کە کلاسیزم رێ و شوێنی تایبەتی خۆی هەیە و هەموو پەیڕەو ـ کەرانی جێ بەجێی دەکەن، لە رومانتیزمدا رێ و شوێنێکی دیاری کراو بەدی ناکرێ و هەر شاعیرە رێ و شوێنێکی تایبەتی خۆی لە چوارچێوەی ئەم قوتابخانەیەدا هەیە ، جا بۆ ئەوەی بتوانین شتێک لەئوسوول وقاعیدەکانی ئەم قوتابخانە بگەین ، باشتر وایە بەم جورەی خوارەوە لەگەڵ کلاسیزمدا بەراوردی بکەین :

١ ـ کلاسیکەکان عەقل بە بناغەی شێعر دەزانن. بەلام رومانتیکەکان زیاتر خەیاڵ و هەست و نەستی شاعیرانە بەو بناغەیەدەزانن.

٢ ـ کلاسیکەکان دەیانەوێ تەنها لە جوانی و باشی بدوێن. بەلام رومانتیکەکان هەوڵ دەدەن سەرەرای جوانی، ناشیرینی و شتە خراپەکانیش نیشان بدەن.

٣ ـ کلاسیکەکان ئیلهام لە شاعیرەکانی پێش خۆیانەوە وەردەگرن. بەلام رومانتیکەکان لە فۆلکلۆری میللی و ئەدەبیاتی هاوچەرخی وولاتەکانی دیکەوە.....

٤ ـ رومانتیکەکان لەجیاتی بەکارهێنانی کێشی ( عەروز )ی عەرەبی و یەک جور قافیە لە شێعریکدا ، گەرانەوە سەرکێشی( برگەیی )

کوردی و شێعری چەند قافیەیی. ئەمە سەرەرای بەکارهێنانی ووشەی رەوان و سادە وەک لەم شێعرەی پیرەمێردا دەردەکەوێ .

**ئاوە جوانەکەی سەر چاوەکەی زەڵم**
**بۆ گەلارێزانی سەر بە تەم و هەڵم**
**ئەڵێی سەرچاوەی بەختی کوردانی**
**سەروەتت نیە وێڵی هەردانی**

**تاڤگەکەت سەربەرز، سارد،وەک تەرزە**
**دانەی مرواری ، لەنجەی سەد تەرزە**
**لەو ئاسمانەوە ئەڕژێتە خوارێ**
**لە چاوی گەردوون فرمێسک ئەبارێ**
**وێنەی عاشقی کە نالەکار بێ**
**سەحرانەوەرد بێ بەیجووری یار بێ**

بە گشتی بەرنامەی رومانتیکەکان بەرنامەی تێکوشان بۆئازادی یەو بە بڕوای وان ئەودەستوور و رێ و شوێنانەی لە شێعر و ئەدەبیاتدان رێ گری ئازادی بیرودەربرینن . بۆیە رومانتیکەکان دەستوورو رێ و شوێنەکانی قوتابخانەی کلاسیزمیان وەلا نا .

ئەدەبیاتی رومانتیک بە ئازادی دەتوانێ لەهەر گوشەیەکی ژیان ، چ جوان چ ناشیرین، چ بەرز و مەزن چنابووت وبچووک بدوێ و دەتوانێ لەهەر دەورەیەکی مێژوویی و لە هەر جۆرە دیمەنێکی دنیا سوود وەرگرێ.خو ئەگەر شاعێر بەهۆی فشاری کومەڵ و یاساکانی ئەخلاقی و داب و نەریتی دواکەوتوانەی کومەڵەوە رێگای پێشکەوتنی لێ بگیرێ ، دەتوانێ لەو یاسایانە یاخیی و حوکمی خۆی بدات ، کە ئەوجۆرە یاخی بوونانە لەنێو شێعرەکانی بێکەسدا زۆر ئاشکرا خۆیان دەنوێنن.

رۆمانتیزم پێی وایە کە تەنیا خەیاڵی بەرزونازکی شاعیر ،خەیاڵێک کە سەر بە هیچ یاسا ودەستووریک نەبێ دەتوانێ قانوونی پیشکەوتنی کومەڵ و ژیان دیاری بکا .

هەروا روانتیکەکانیش وەک کلاسیکەکان شەیدای ژیانی دێنشین و سروشت و شاخ وکێون بەلاّم شاعێری رومانتیک بەو شێوەیە لەسروشت دەدوێ کە ئارەزووی دەکا نەک بەوجۆرەی که هەیە .کاتێک کە شایی بە ئەوینەکەیەتی یان دلّی شادە ، گولّ و چەم و نزار و خورِ و مانگ و ئەستیرەکانیش لەگەلّ وی دەکەونە عیشق و سەما .بەلاّم کاتێک دلّی تەنگ دەبێ جیهانیش لەگەلّ وی دا رەونەق و جوانی نامێنێ و تەنگ دەبێتەوە .

شایانی باسە رومانتیزم لەسەر دەستی پێرەمێرد و بێکەس و قانیع و گۆرانی و چەندانی دیکە هاتە نێو شێعری کوردییەوە . بەلاّم پێویستە بلّێین کە هیچ کام لەو شاعێرانە سەبکی دیاری کراوی خۆیان رۆمانتیزم نەبوو، بەلّکوو ئەو رێبازەی ئەوان لە سەری دەرویشتن تێکەلّ لە کلاسیزم و رومانتیزم و تەنانەت سەرەتای ریالیزمیشی پێوە دیار بوو ،بەتایبەتی گۆران کە پاشان بوو بە پێشەوای قوتابخانەی ریالیزم لە شێعری کوردیدا ،کە ئێستا دێینە سەر باسی ئەم قوتابخانەیەش .

### ٣ ـ قوتابخانەی ریالیزم :

رۆمانتیزم لەسەریکەوە بە هەمان رێدا دەڕۆیی کە لە داهاتوودا ریالیزم دەبایە بە توندوتۆلّی پێیدا بڕوا .واتا لەجیاتی باسی جیهانیکی روون کە شێوە و رەنگەکانی لەپشت پەردەیەک کە لە چەند رێ و شوێن و ئوسوولی ئەدەبی تێکەلّ پێکەلّ پێک هاتبێ ، باسی دنیایەکی دەکرد کە شێوە و رەنگی واقێعی خۆی پێوە دیار بوو، ئیلهامی لە رابووردوویەکی مێژوویی یانلە دەورەیەکی هاوچەرخ وەردەگرت ، بەلاّم بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دوو گیروگرفتی لەبەر دەم بوو ،

بڕوانە لاپەڕەی ٩٤

# برایەتی

مامۆستا مەلا عەبدوللای موزقەری

حەزرەتی موحەممەد (د.خ) لە ماوەی پێغەمبەرایەتی خۆیدا ئاینێکی دا بە جەهانیان کە یەکێک لە بەرزترین وئاشکراترین دیاردەکانی پێک هێنانی بەرابەری و وەلانانی جیاوازی لە نێو هەموو میللەت وگەل وچین ورەگەزەکان بوو .

ئەم سەروەرە وەختێک زهووری کرد کە تەعەسوبی کوێرو نەزانانەگەیبووە ئەوپەڕی خۆی وهەر گەلەی خۆی پێ گەورەتر بووولەوانی ترخۆی هەڵداوارد ورەگەزی خۆی پێ باشترین رەگەز بوو .

لەنێو عەرەبەکانیشدا هەر وابوو هەر ئێل وهۆزیک ،ئێل وهۆزی خۆی وەسەرەوە دەخست وجگە لە هۆزی خۆی لەگەل هیچ ئێلێکی تر خزمایەتی ونزیکایەتی نەدەکرد و تەنانەت هیندێک خۆیان بە خیزی سوورەوە بووی سەر ئاگر دەشوپاند کەکەس زاتی نیەلێی نزیک بێتەوە .

بەڵام حەزرەتی موحەممەد (د ـ خ)بەزهووری خۆی ئەم ئاورەبەگڕو بڵێسەیەی دامرکانـد و فەرمایشی خوای یەکتای جێگر کرد :

**یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی و جعلناکم شعوبا وقبایل لتعارفوا ان اکرمکم عندالله اتقیکم(۱) .**

**"خەڵکینە ئێوەمان لەپیاووژنێک خولقاندـ ووە بە شێوەی گەل و هۆزوقەبیلەی جۆراوجۆر تا یەکتر بناسن .ئەڵبەت بەڕێزترینی ئێوە لە لای خودا بەتەقواترینی ئێوەیە " .**

ئەمجار بناخەو بنەڕەتی بەڕێوەبـردن و جێ بەجێ کردنی کاروباری موسڵمانان هەربوو بەمە کە تەعەسووبی گەل وهۆزان لەنێوبچێ وبایەخی نوێ جێگەی بگرێتەوە تا ئـەم جێگایە کە "خوا یارمەتی داوخەڵک دەستە دەستە بوونە ڕێرەوی دینی خوداو خودای تەبارەک و تەعالا بەم شێوەیە بە پێغەمبەرو ئیمانداره‌ـ کانی فەرموو:

**هوالذی ایدک بنصره وبالمومنین والف بین قلوبهم لوانفقت مافی الارض جمیعا "ماالفت بین قلوبهم ولکن اللهالف بینهم انه عزیز حکیم .**

**ئەو کەسێکە بە نوسرەت ویارمەتی خـۆی و ئیماندارەکان تۆیاریدەدا وپەیوەندی لەنێو دڵان هاویشت بە شێوەیەک کە ئەگەر هەرچی لەم دنیایەدا هەیە داباتـ نەتدەتوانی ئـەم پەیوەندو خۆشەویستی یە بەرقەرار بکەی . بەڵام خودا بۆخۆی خۆشەویستی وپەیوەندی لـە دڵی نان .بەڕاستی ئەو بەڕێزو زانایە (۲ ) دیسان فەرمووی :**

**یا ایها الذین امنوا اتقوالله حق تقاته ولاتموتن الا وانتم مسلمون واعتصموا بحبل الله جمیعا ولاتفرقوا واذکروا نعمه‌الله علیکم اذاکنتم اعدا "فالف بین قلوبکم فاصبحتم بنعمته اخوانا وکنتم علی شفاحفره من النار فانقذکم منها کذلک یبین الله لکم الایات لعلکم تهتدون .**

**ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لـە قەهروغەزەبی خودا خۆبپارێزن وهەقی تەقوا بەجێ بێنن وجگەلە ئیسلام بە هیچ شتێک درووود مەڵێن وهەمووده‌ست بە تەنافی خودا بگرن وخۆی پێوە هەڵاوەسن وبڵاو مەبن ونیعمەـ تەکانی خودا وەبیر بێننەوە ،ئەو دەم کە دوژمنی یەکتر بوون وخودا دڵی ئێوەی لێک نیزیک کردەوە ولە سایەی ئەم نیعمەتەوە بوونە برا .ئێوە لەسەر لێوی کەندالی پڕ لە ئاگردابوون خودا ئێوەی رزگار کرد .خودا ئاوا ئایەتەکانی خۆی ئاشکرا دەکاتا بەڵکوو ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوەو هیدایەت بن .**

چون خودا پێغەمبەری (د ـ خ) گرتە ژێر باڵی ڕەحمەتی خۆی ئەسحابەکانی ئەویش (علیهم‌رضوان ا ...)وەدوای کەوتن بەڵام تووشی کەندوکوسپێکی زۆربوون وئەوە بوو بە هـۆی دووبەرەکی لەنێو ئەواندا .بەڵام ئەودووبەرەـ کی یە لە جەغزی حەق وخێرخوازی دەرنەدەچوو بەدوای ئەوەدا کە دەورەی هەوەڵی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلام بەسەرچوو زۆربرین لە لەشی ئەم ئۆمەتەکراو بە داخەوە دڵسۆزێک نەبوو بتوانێ دەرمانی بکا ،تەنانەت ئەدیبە ئورووـ پایی یەکان کەسانێک بوون کە یـەک لـە

دوای یەک چەرمیان بەسەر ئەم برینانـــەدا کێشا تا نەبیندرێن وکەس پێ یان نەزانێ .

ئاخری سیاسەتکاری خۆی کردوتەعەسوبـی کوێر وەک سەردەمی پێشوو پەرەی گرتـــەوە و دووبەرەکی وناکۆکی پتربوو .موسڵمانـــان بوختانیان بەیەک کرد ودڕدۆنگی ونابەدڵـی پەرەی گرتەوە وهەرکەسە بەرێگەیەکدا رۆیـی ولە ئاکامدا رێگەی راستیان لێ هەتڵە بوو.

لە لایەکی ترەوە دوژمنانی ئیسلام دەرفەـتیان بۆهەڵکەوت ودەستیان لەعیلم و مێـژوو ریوایەت وەرداو دەروی دڕدۆنگی یان بۆئاوەڵا کردنەوە وموسڵمانیان لەگیانـی بەردان وبەم جۆرە خافڵاندیانن .

بەم خافڵاندنە سەریان لێ شێوا .هێزەکەیان لەکەمی دا سستبوونەوەوباوەڕومتمانـــەی خۆیان لەدەستدا وباوەڕ بە خۆڵە نێو دڵیـان کۆچی کردولە ئاکامدا نەتەوەکەیان کوتکوت کرا وبە خەزا بەشبەشکرا وتاوێک بە ناوی ئیستعمارو جارێک بەناوی حیمایەت وگاوێک بە ناوی نێوبژی وزەمانێک بەناوی سەودا .... و هەروەها بە زۆر ناوی تر کە دەیانتوانــــی زوڵمیان لە موسڵمانان کردوبەردێکیان لەسەر کردەوەی دژی ئینسانی وتەماحی خۆیان دانا .

ئەوە حاڵی موسڵمانی ئیمرۆیە .هەڵبـــەت دەردی گەورە وەختێک دەستی پێکرد کەموسڵمانان پشتی یەکتریان بەردا و پەراکەندە بوون وئێستاش بەپێی ئایەتی"**کل حزب بما لديهم فرحون**" .

**هەر دەستەیەک بەوەی کە لە لایانە کەیف خۆشن " .**

هیچ رێگایەک بۆچارەسەری ئەم زامە نیە بادانەوە نەبێ بوئەم سەروبەندە کە خودای ، میوی مەزن لە هەوەڵەوە بۆی داناون وئەوانی یەکدەستە کردووە هەڵبەت بێ ئەوە کە لـــە نێوان تایفەو ئێل وهۆزەکاندا دووبەرەکـی و ناکۆکی بمێنێ ،بێ ئەوە کە شیعە سەبارەت بە سوننی وسوننی سەبارەت بە شیعە شتی باتڵـی بە مێشکدا بێ ولە یەکدی دڕدۆنگ بن ومەتمانەیان بە یەک نەبێ .

فەرمایشەکانی قورئان وریوایەتەکان بـــە تەواوی بەڕێوە بەرن .

بەڵێ ئوسوولی ئیسلام یەکە .تـــەواوی موسڵمانان بەخودا و بەدوارۆژ ومەلایکـــە و کتێبی ئاسمانی وپێغەمبەران (د خ)ئیمانیان هەیە وهەموو لەسەر ئەمبڕوایەن کە قورئان و پێ سپێراوی موحەممەد (د خ) هەقە وئەگەر ، ناکۆکی یەک پێک بێ دەبێ لە بەرقاپی خودا و پێغەمبەراندا بێتە گۆڕێ .

قیبلە ونوێژ یەکە واتە لە ئەساسدا جیاوازی نیەو ئەسڵەکانیبنەڕەتی ئیسلام شتاق هۆی ناکۆکی نین .

.دەبێ دان بەوە دابنێین کە موسڵمان کەم هێزن چون وەک تۆوی زەوی پرش وبڵاون،چون لە بیروباوەڕ ورەسمی یەکتر ئاگادار نین ، کەسێک کە شتێکی نەزانی لەگەڵی دەبێتە دوژمن وئەگەر موسڵمانان لێک نزیک بووبانەوە پترلێک حاڵی دەبوون وئەم حاڵی بوونە دەبوو بەهۆی لەنێوچوونی دووبەرەکی یەکان . یا ئەوە کەبە پێی ئەسڵە بنەڕەتی یە هاوبەشەکان رێزیان لێک گرتبا هەر وەک پێشینیانمان کردوویانە بە کوردی سیاسەتی دەولەت و میللەتەکان لە جیهانی ئیمرۆدا پەیوەندی بەیەکگرتوویی ویەکەتی وبرایەتی هەیە .

موسلمانان دەبێ دەست بدەنە دەستی یەکدی ولە مافی یەکتر پارێزگاری بکەن لەبچووکترین دەرفەت ودەرەتان کەلک وەربگرن بۆ پەیوەندی گرتن ولێک نزیک بوونەوە .

موسڵمانان دینیان یەکە .کتێبیان یەکە ، لە ماوەی ژیان وتەنانەت دوای مردنیش. ئامانجێکیان هەیە وقانوون وزاکوونێک ئەوان بۆیەکەتی وبرایەتی پاڵ وێک دان بانگ هێشتن دەکا . ئەم مەبەستە هەم بۆدینەکەیان باشە وهەم بۆ سیاسەتەکەیان .هەروەک بار و دۆخی ئێستای دونیا ئەمەی سەلماندووە .

نابێ ناکۆکی ودووبەرەکایەتی لە نێو موسڵمانان‌دا بمێنێ هەموو ئەوە بزانین کە موسڵمان بۆموسڵمان وەک کۆڵەکە وایە وهەر یەکە لایەکی رادەگرن هەر بۆیە خوافەرمووییەتی "واعتصموا بحبل الله جميعا "ولا تفرقوا "

لەخوای میری مەزن دەپارێمەوە کە هەموو موسڵمانان لەوبلاوی یە رزگار بکا وئەوان بۆ رێگەی چاکەوخێر لێک نزیک بکاتەوە وهەستی تەقوا لە هەمواندا بەدی بێنێ .جا ئەو جار رەفتار و کردەوەی سەرداری مەزنی ئیسلام حەزرەتی موحەممەد (د- خ) ببێتە سەرمەشقی ژیانی هەموو موسڵمانان .

ئامین یارب العالمین .

(١) - سوورەی حەجەرات ئایەی ١٣

(٢) - سوورەی ئەنفال ئایەی ٦٢

(٣) - سوورەی ئالی عیمران ئایەی ١٠١ - ١٠٢

# رەخنە و پێشنیار لە سەر باس و لێکۆڵینەوە ئەدەبی یەکان

پێشەکی یەک بۆ ئەم زنجیرە باسە

ئەوەی لێرە دەیبینن رەخنە و پێشنیاری ماموستایانی خاوەن ڕا و هەموو خوێنەرە بەڕێزەکانی سروە لەسەر باسە زانستییەکانی ئەدەبی کوردییە. خوا یار بێ لەم جێگای گۆوارەکەماندا جار لەگەڵ جار نەزەر و رەخنە و پێشنیاری هەموو خوێنەرانی سروە رادەگەیەنین و دەیانخەینە بەرچاوی خوێنەران. بەڵام پێویستی بە روون کردنەوەیە کە دەقی نووسراوەکان بەبێ هیچ چەشنە دەست تێوەردان و تەنانەت بەبێ راستکردنەوەی هەڵە ئاساییەکان (وەک دانانی نیشانەی "ˇ" و "ـ" و "ˇ" و هەڵەی ئیملایی و...) چاپ دەکەین، کەوابێ تکا دەکەین کە رەخنەمان بۆ دەنێرن خۆتان چاوێکی دیکەی پێدا بخشێننەوە و بەبێ هەڵە بۆمانی بنێرن، هەروەها ئەوەش دەبێ بڵێین لەگەڵ رێزدانان بۆ نەزەر و رەخنە و پێشنیاری خوێنەرانی خۆشەویستمان، هەروەک پێشتر رامانگەیاندووە بۆ ئەوەی لەو نەزمەی گرتوومانە بەر، لانەدەین هەرچەند بەشێکی زۆر لەو پێشنیارانەشمان قەبووڵ بێ هەتا پەسند کردنی رێبازێکی دیاری کراو لە لایەن کۆڕ و کۆنگرەیەکی ئەدەبییەوە، لەبەر چاویان ناگرین و تەنیا بو ئاگادار بوونی خوێنەرانی دیکە بڵاویان دەکەینەوە.

هیوادارین لە داهاتوودا تێکرای ئەم باسانە و رەخنەی خوێنەران بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ بڵاو بکەینەوە و دەمەتەقەیەکی ئەدەبی بکێشینە نێو کۆمەڵ و مەیدان بۆ پێک هێنانی کۆنگرەی ئەدەبی ئامادە بکەین، لەو کۆنگرەدایە کە گیر و گرفتەکانی ئێستای زمانی کوردی چارەسەر دەکرێ. انشاء الله

**مهاباد : ماموستا حاجی مەلارەشیدی قەرەنی زادە**

شیوەی نووسینی خەتی کوردی بەتایبەت لەبارەی "**الف**" و "**واو**" و "**یی**" و "**ر**" و "**ل**"

پیتەکانی هەر زمانیک خاوەنی دو بەشە، یان دەنگی خالیسن وەک :

"ا" و "و" و "ی" یان حروفیکـــــــن بەیارمەتی "بزوت"، "بزوین"، "حەرەکە" تەلەفوزیان پی دەکری و دەنگ لەوان بلند دەبی .

زمانی کوردیش لەو یاسایە بەدەر نیە. حروفی دەنگ "صدا" کە بریتن لە "ا"، "و" "ی" هەر یک حوکم و تایبەتیکیان هەیە، مــن لیرە بەکورتی دەینووسم : **یاسای تیکرایی** بو تەلەفوز بە "ا" و "و" و "ی" ئەوەیە کە

"ا" خوازەری سەردان پیتی خویەتی وەک : کار یار، زار و ...

"**و**" : خوازەری ژیوی پیتی پیش خویەتی وەک : گیو، گیوکە، زیوەک، دیوەگ و چیووک و ...

یانی لەهیچ زمانیکدا تو ناتوانی تەلەفوز بە "**الف**" و "**واو**" و "**یا**" بکەی بی ئەوەی سەر نەدەی بە حرفی پیش "ا" و "**بور**"، ئەوەی بە حرفی پیش "**و**" و ژیو : نەدەی بە حرفی پیش "**ی**".

**باسایکی تر** : دەنگی "بور" دان بە پیتی "**و**" و ژیو، دان بە پیتی و بو "**ی**" وەک : دیوەک، زیوەک، قیر، و... کاری بنەرەتی وانە یانی پیویست ناکا نیشانەیان لەسەردا بنین تا دەرنجەین ئەو دەنگانە بگەیەنن .

بەلام کاتیک "و" و"ی" لەحالەتی دەنگ "صدا" دینە دەر چون لە یاسای بنەرەتـــی خویان دەردەچن پـیویستە بە گویـــــرەی دەنگیکی لـیان هەلدەستی نیشانەیان بـو دابنین .بو نمونە وەک واژەی " خوار "،"بور" " جەور، کە ناچارین لەسەر واویی " خـوار" "بور" عەلامەتی " " دابنیین تا نیشان بدەین دەنگی " و " لەوانەدا و لـــە وینەی واندا سەدایکی کلـلورە ( نەتـەو ) و پورە. نە تەوار، سەر بەلکو دەنگیکی هولولە وەک سەدای " و " لە " کور"، " چور" و شیر و زیر و...دا. و بو "ی"یش دەنگیکی هیر لە، لە بەیتی "یا" و" الف" دا کە بە عەرەبـــی پـیدەلـین "ئیمالە" دەبیسین .

لە حالەتی دارا بوونی سکونی "واو" و "یا"دا کە هیچ بزوتیکیان ( ــ ــ ــ ) نیە. بە ئیستیلاحی عەرەبی سکونیان هەیە وەک: " جەور" ،"کەو"،"خەو" و... و بو "ی" وەک: ."سەیر"،"حەی" ،"خەی" و ....

پـیویستە عەلامەتی " ـ " سکون کـە بـــە کوری پـیی دەلـین " زەنە" لەسەر " واو" و "بی " بنووسری.وەختیک لە ناوەنـــدی واژەدا قەرار دەگرن.زور جاران "و"و " ی" زەنەدار دەکەونە دوایی واژە ،وەک: " خیـو ، "شیو"،"چیو"، و ..... یانی وەک : "بی"،"چی" "شیی" ،رەنگە پـیویست بە دانانی نیشانـەی بزوت نەبن.

رەنگە هیچ کات واژیکمان نەبی لـــە سەرەتای کەلیمەدا " ی " بـیو خاوەن " بور" مەسەلەن بـیژین " یورک" چونکە لـەســەر زمان گران ئەدا دەکری .

پـیشینانی ئیمە ( مام وەستا و فقیکانی حوجرەی ئاینی) پاریزگارانی فەرهەنگ و دینی و رەوشت و ئادابی نەتەوەکەمان،هەر لە کونەوە، دە بەرانبەر حەرەکەی زمانی عەرەبیدا ( ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ ـ )عەلامەتی سەرەتایان دەگەل شکلی حەوتەم ـ پەسند کردوە و لە زمان و خەتی کوردیدا دەکاریان گرتوە کاریکی بەجیشە .

لەجیگای ـ کە نوینەری دو حرفی هاوجیسنە و تیکدا دەغم کراون،هەر دووک پـیتەکـــان دەنووسن وەک : " بررەک"،دەیگرن و چون لە کوردیدا تەنوین( ـ ـ ـ) نیە کاریان پــی نەداوە و لەجیگای ( ـ ـ ـ ) لەپـیتی دەنگ "و" ،"ی" و "ا" کەلکیان وەرگرتوە، مـــن پـیموایە بەناوی ریز لە بیر و باوەری زانا رابردووکانمان ئەو شیوەیە قبول بکەین ە حالەتی دانی " بزوت" بە پـیتەکـــان ، پـیدەلـین ( حینجە ).

هەر وەک دەزانین ، لەکونەوە بـەسی لەهجەی "کرمانجی"و " سورانی"و " هەوامـی" پـیلدە زانا و هونەرمەندەکانمان وەک : **ئەحمەدی خانی و مەلا خضرنالی و خانـای قوبادی و مەولەوی سید عبدالرحیم و حاجـی قادر نەمر و جەنابی ملای کویە** کتیب و شیعریان کوتوە و بناغەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیان دارشتوە.

بەلام چارە ئەوەیە: پاشەوەی لەهجـــەی سورانی بە حوکمی ئەوە لە ناوەنـــدی کوردستاندا قەراری گرتوە و دوی هـــەم خوش ئاهەنگترە و سادەتر و شایـــەد زانستیتریش بی بە پایە بناغەی زمـانی ئەدەبی کورد، پەسند بکری، بەلام پـیویستە لە هەموو لەهجەکانیتر واژەهایکی کە خوش ئاهەنگ و رەوان و دل گیرن و یـــان وارەهایکی ئەوتون کەلە فەرهەنگی(سورانی) دا نیمانە و ئەوان هەیانە خوراکـــی بدەینی.تا هەم پەرەمان بە فەرهەنگـــی کوردی دابی هەم قەدر و قیمـەتـــی لەهجەکانی ترمان پاراستبی .

وەرە کە وەک پایزێ زەردە رەنگم
دەنالێنم بەڵام ناتگاتێ دەنگم
وەرە سەیرێ ، سەرێ هەڵ بێنە تاوێ
وەرە لەوناوە سیلە چاوێ باوێ
ئەو دەمەی وا دەمرن بزە لەسەر لێو
کاتێک کەس نایەوێ خشڵی زێڕو زێو
ئەو دەمەی واتێک دەشکێن بازنە و خرخاڵ
کاتێک بێ کل دەمێننەوە چاوی کاڵ
ئەو دەمەوی وا دەکرێنەوە کوڵوانە
ئەو کاتەی وا فڕێ دەدرێن لەرزانە
ئەو دەمەی دەستی داوەتێ بەردەدرێن
کاتێ یەخەو بەرۆک لە کوڕان دادەخرێن
ئەو دەمەی وا خەم لەخەیاڵ دەهاڵێ
خەیاڵ لەدەس خەمێ دەگری وچ ناڵێ
ئە دەمەی کوڕ ئەژنۆ دەگرن لە باوەش
کیژان لەسەر دەهاڵێنن دەسرەی رەش
ئەو دەمەی وا لە خەم دەدرێن سۆرانی
"ناڵەی جودایی" دەگرێ جێی گۆرانی
ئەو دەمەی وادەنگی نایە هەیاسە
هەیاسە و سینە هەڵ دەگرێ هەناسە
ئەو دەمەی وا جێژوان کرو بێدەنگە
ئەو کاتەی وا دڵی کیژ و کوڕ تەنگە
ئەو دەمەی وا سەرشین دەکەن کەزی شۆڕ
ئەو دەم کە دەبنە کوێن کەتان چین و تۆڕ
ئەو دەمەی والاو بەردەدەن گوێ سوانان
کابان بەمەشکەی هەڵ ناڵێ بەیانان
ئەو دەمەی شوان دەست دەبزێوێ لە بلوێر
تێکەڵ دەبێ دەنگی لەگەڵ ئاو هەڵدێر
ئەودەم کە پیرە شوان پەیام دەنێرێ
بێری بەرێ دەکا وەڵامی خێرێ
ئەو دەمەی وا پشوو نایە لە لایە
ئەو کاتەی وا بەهاردێ سروە نایە
ئەودەم "شاری مەهاباد" لە تەمێ دا
نەک مەهاباد موکریان لەخەمێ دا
ئەودەم هێدی لەتاسەی تۆدا دەمرێ
من راست ئەودەم ژانی شیعر دەمگرێ
بەیادی تۆوە دەیکەمە وڕێنە

لێک دەهاڵێم وەک ماری سەر خەزێنە
من ماتی تۆم دەڵێن خەوی گرانە
بەرۆژ سڕم جینگڵ دەدەم شەوانە
بۆ وەی ئەوڕۆ بزانم بۆ تۆ بدوێم
دەرکا و دەرک هێمن لە دوای شتی نوێم
هەرگوشەیەک سەد جاری لێ دەنۆڕم
وشە هەیە ، سەدباری لێ دەگۆڕم
وەک راوچی دەستی دەست رێژێ دەبزێوم
بەڵام کەمتر ئامانجی خۆم دەنگێوم
وەک تەیری دێم دەڕۆم بەرەو نیشانە
لە نیوی رێ یە دەیکەمە کەوانە
چ بکەم نێچیر مامزی بێ پارێزە
راوچەند پەیتە ! راوچی هیندە بێ هێزە
خەیاڵێ‌من‌هەودا یەکە و بۆتە داو
مەلی وریا چۆن دێتە سەر داوی خاو ؟
گەلێک جاران دەکەومە تاریکایی
دوور دەبینم گڕ و تەم وتارمایی
نازانم تۆی وئاگرت لە دەروونندا
یان هێمنە لەناو " تاریک وروون " دا
زۆر وادەبێ دەفریام دێ خەیاڵم
من بۆی دەرۆم ئەویش دەبێتە باڵم
ئیتر پاردە و پەرژین ناگرن بەری من
بەرو باخەڵ داخنم لە گوڵی دەستەچن

---

جارجاریش هەر تاسەو دووری ئازیزە
شیعری جوان رووم تێ ناکا لێم زیزە
دڵ هێند ساردە وشە لەزارم دەخزێ
هەڵبەستی من لەسەر لێوم دەلەرزێ
وەرە بائەمنیش بگرێ هەست وسۆزت
وەرە سوور هەڵگەری بە "رقی پیرۆزت"
وەرە تۆ هێندە بۆ لەو ژینە تێری
وەرە چاوی لەرێتە "شەنگە بێری"
وەرە وەرە مەرۆ بە نامرادی
وەرە هێمن ئەتۆو "عیشق وئازادی"
وەرە هێمن پەلەی چیتە بۆمردن
ئەتۆو "مەتەرێزی شەرەف" چۆل کردن
ئەتۆ و وا بۆ مەرگ سەر دانوێنی
وەرە هێمن ئەتۆو "پەیمان شکێنی"
ئێوە مەڵێن شین بۆ هێمن دەگێرین
مەڵێن رۆژ بۆ چلەی هێمن دەژمێرین
مەڵێن هێمن دەردی گەلی دەزانی
مەڵێن بەو رازابووە وێژەوانی
مەڵێن هێمن خۆیی دوورە ولات بوو
مەڵێن هێمن دەستە چیلەی خەبات بوو
مەڵێن هێمن ودمی شیعری بەدەست بوو
مەڵێن هێمن خوای شیعرو هەڵبەست بوو
مەڵێن هێمن نەبوو نەی بوو دەی نالاند
نالەی ئەو بوو خەڵکی لە خۆی دەهالاند

مەڵێن هێمن سەرسەختی دڵ گەرم بوو
وشە وەک مێو لە دەستی دانەرم بوو
مەڵێن هێمن هەست هانی دا نەڕاندی
خەوی گرانی گەل هێمن رەواندی
مەڵێن هێمن وێنەی گەلی واکێشا
سەرنجی سەد وێنەگەری راکێشا
مەڵێن هێمن چیرۆکی خەو رەوێن بوو
وتەی هێمن بۆ هەڵبەستان هەوێن بوو
مەڵێن هێمن رۆیی کوردستان شێوا
پیرو جحێڵ قوڕیان بۆ هێمن پێوا
مەڵێن هێمن ئاوێنەی دەرد و ژان بوو
باری ستەم لەسەر شانی گران بوو
مەڵێن هەرچی زەو زووی کرد زەمانە
هێمن هەریەک بوو پێی نەکرانە دووانە
مەڵێن هێمن بەو خاکە بەوەفا بوو
دایکی وەتەن کوردانە گۆچی دابوو
ئیتر مەڵێن هێمن شێری پرچن بوو
هێمن هێندەی بەسە بڵێن "هێمن" بوو
منیش نالێم هێمن کەم هات بە بیرا
نالێم هێمن رۆیی قەدری نەگیرا
ئێستەش نالێم وەرن رێزی لێ بگرن
من هەر دەڵێم : دەگەڵ کەسی رامەگرن

هیدی

---

**فۆڕمی ئابوونمانی گۆواری سروە**

من [illegible] سەد و دە تمەن ( ۱۱۰ ) پوولم بە حیسابی ژمارە ۵۴۰۰ ی بانکی سپە ، شوعبەی مەرکەزی ورمێ، ( اورمیە ) بە ناوی ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەییووبی بۆ ناردوون . داوا دەکەم لە ژمارە [illegible] ی سروە بە دوام جار لە گەڵ جار بۆ بنێرن ، ناو نیشانم ئەمەیە :

ناونیشان : [illegible]
........................................................
[illegible]

# داوای لێ بووردن

خوێنەرانی بەڕێز:

لە سروەی ژمارە پێنجدا هیندێک کەموکووڕی بەتایبەتی لەباری فەننیەوە وەبەر چاو دەکەوێ.یەکیان ئەمەیە کە ناوی نووسەری هێندێک وتار نەنووسراوە،کە لێرەدا دەیان نووسین:

| لاپەڕە | | وتار | نووسەر |
|---|---|---|---|
| لاپەڕەی | ٨ | ئیبراهیم (د- خ) | مامۆستا مەلامحەممەدی رەبیعی(باختەران) |
| = | ١٨ | بیرەوەری | رەحیمی داودیان (مەهاباد) |
| = | ٤٥ | قوڕشێلان | عومەری فارووقی (سەقز) |
| = | ٤٨ | خەجیلێ | کەریمی فەرشی (مەهاباد) |
| = | ٥٠ | مامحەسەن | ئەحمەدی بەحری (مەهاباد) |
| = | ٥٦ | مەگیرانی | عەبدوڵڵای مودەڕیسی (شنۆ) |
| = | ٦٢ | مەشکە | نەسرینی جەعفەری (مەهاباد) |

ویژەنامە

| لاپەڕە | | وتار | نووسەر |
|---|---|---|---|
| = | ٧ | پیوسۆز | فەتتاحی ئەمیری (بۆکان) |
| = | ٢٣ | کۆچی دوایی | عەلی ئیسماعیل زادە- ڕێبوار-(مەهاباد) |

ڕوون کردنەوەیەک لەسەر فۆرمی ئابوونمان

ئەو ١١٠ تمەنەی کە دەینێرن بۆ ئابوونمانی شەش مانگ یا ساڵێک نیە ، بەڵکوو بۆ شەش ژمارەی " سروە "یە کە خەرجی پۆست کردنیشی خراوەتە سەر ، دیارە بۆ داخوازان لە دەرەوەی وڵات زۆر و کەمی زێدە خەرجی پۆستیشی دێتە سەر ، کە بۆ خۆیان دەتوانن بەراوردی بکەن .

اورمیه : صندوق پستی ٧١٧ ، تلفن ٣٥٨٠٠.

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی

عومەری فاروقی

# شێخ حەسەنی مەولاناوا

## زانایانی بەناوبانگی کورد...

مەڵبەندی سەقزی سەربەرز، واتە ئەم بەشە رەنگین و رازاوە وشاخاوی یەی کوردوستانی خۆشەویست پەروەرگەی زاناوبلیمەت وشاعیری ئەوتۆمەزن بووە کە ناویان هەتا هەتایە لە مێژووی ئەدەب وعیرفانی گەلانی ئێران ورۆژهەلاتی ناوەراست وئیسلامی گەورەدا وەکوو ئەستێرە دەدرەوشێ وپرشنگ داوێ.بەتایبەتی بەشی خورخورەی سەقزوداوێنەی شاخەبەرزەکانی بست وشاقەلا، کە زنجیرەی کوێستانی گەورەی چل چەمەن پەروەرگەی زانای وەکوو شێخەکانی بست ومولاناوا بووە. لەمانە شێخ زین العابدین (ناظر بستی) وشێخ حەسەنی مەولاناوا زۆربە ناوبانگن. لەم بەشەدا مەبەستی من ناساندنی عارف وشاعیر وحیساب زانی گەورە واتە شێخ حەسەنە.

سەبارەت بە سالی لەدایک بوونی شێخ حەسەن تا ئێستا ساڵێکی دەقیق نەنووسراوە بەلام ماموستای هێژاو گەورە مەلا عبدالکریم مدرس، لە شەرحی دیوانی مەولەویدا سالی وەفاتی بە ۱۱۳۶کۆچی مانگی واتە ۲۶۹ ساڵ لەمەو پێش دادەنێ وماموستای خوالێ خۆش بوو ناوداری کوردیش واتە ماموستا عەلائەدین سەجادی ئەو سالەی بەراست زانیوە جا ئەگەر ئێمە تەمەنی شێخ حەسەن بە حەفتا ساڵدا بنێین کەوەکوو دەڵێن ئەوەندە ژیاوە سالی لەدایک بوونی دەبێتە ۱۰۶۶کۆچی مانگی. بەو جۆرەی موریدان و پەیرەوانی ئەوقسەی لێ دەکەن شێخ حەسەن دەورانی فەقێیەتی لە عێراق وسووریەوکوردستان تەواو کردووە، پاشان گەراوەتەوە **بە** مەولانا ناوی دەرکردووە وخانەقایەکی داناوە کە بە مەولاناوا ناونراوە.

شێخ حەسەن لە تەریقەتدا یەکێک لە پەیرەوانی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غوث الاعظم) بووە وبە یەکێک لە مشایەخی قادری دەناسرێ.

لە عیرفان وکەراماتدا دەستێکی هەرەبالای بووە و نەفسی دونیایی تەرک کردووە، بە تەواوی رووی کردۆتە ئاخیرەت ودونیای لەبەرچاو نەهاتوو .تەنانەت ژنیشی نەهێناوە وپاش ئەو بنەماڵەی براکەی پشتاوپشت بوونەتە جێگاداری،بەلام کەس نەیتوانیوە بەپلەوپایەی ئەو بگا.

سەبارەت بەکەرامەتی شێخ حەسەن شتی زۆرسەرنج، راکێش دەگێرنەوە کە ئەم بۆ خەواریقی ئەولیای خوا بە زۆرنا ژمێردرێ چون ئەگەر ئێمە سەرنجی تذکرەالاولیای عطارنیشاپووری ومقامات ژندەپیل شێخ احمدجام واسرار التوحید ومقامات! بوالسعید

بدەین تێ دەگەین کە خەواریقی ئەولیا زۆرلەمانە پتربووە، ئەوەی راستی بێ بە پێی ئەوبەڵگانەی کە بەدەستەوەن نادرقولی هەوشار کە پاشان بە نادرشای ئەفشار ناوی دەرکرد وبووبەدامەزرێنەری زنجیرەپاشایەتی ئەفشارلە ئێرانداوپەیڕەوی لەمەزهەبی سوننی دەکرد کاتێک گەورەومەزنەکان و سەرۆک عەشیرەت ومەلاکانی ئێرانی لە دەشتی موغاندا کۆکردبۆوە لەسەر رێگای خۆی لە ئیسفەهانەوە بۆموغان گوزەری کەوتۆتە مەولاناوا و بە خۆی وئۆردووحەشیمەتەوە لەشکربەزی کردووە .دەڵێن کاتێک شێخ حەسەن چاوی کەوت بە ئۆردووینادر فەرمووی ئەوانە میوانی ئێمەن دەبێ میوانداری بکەین جا بە فەرمانی ئەو چەن قازانی پڕلە ئاویان ناسەرکوانوو و پاش ماوەیەک دیتیان هەموو قازانەکان پڕن لە چێشتی خۆش وبەشی هەموو ئۆردووی، کرد .لێرەدا نادر چووە زیارەتی شێخ ودووعای مورەسەع وسفرەیەکی چەرمی گوڵدۆزی کراووکتێبێکی خەتی جوانی بە ناوی (نفایس الفنون)ی پێشکەش کرد.

شایانی باسە بگوترێ ئەم یادگارانە ئێستاش لە مەولاناوا وسەقزوبست و لە بنەماڵەی شێخدا پارێزراون .

کەرامەتی شێخ حەسەن دیارە یەکجارزۆر بووە لە دیوانی مەولەوی کورددا ، نووسراوە خوالێ خۆش بوو مەولەوی کەبۆخۆی یەکێک لە عارفە پایەبەرزەکانی کوردستان بووە وچەندین ساڵ پاش وەفاتی شێخ حەسەن ژیاوە کچێکی شیری بووە کە ژنی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانیجاف دەبێ لەوسەردەمەدا باوبوو هۆزی جاف بۆپەروەردەی ئاژەڵ ولەوەڕاندنی مەڕوپاتاڵ ئەمدیوئەودیویان دەکرد .

کاتێک کە بنەماڵەی کچەکەی مەولەوی بەرەوشاخەکانی مەولاناوا کۆچیان کرد خوالێخۆشبوو مەولەوی تاوەگۆزی وەکوو کەسێک کەلەگەڵ هاوالێکی خۆی بدوێ وئەوکەسە لە حالی حەیات وژیاندابێ دواووشیعرێکی بلێندی گوت کە ئێستا لە دیوانەجوانەکەی ئەوشاعیرە پایەبەرزەدا هەیە

یەکێ‌تر لە کەراماتی شێخ حەسەن کە خەڵک یەکجار بڕوایان پێی هەیە ئەوەیە کە دەڵێن هەر ژنێ سک و زانەکا ئەگەر سێ جار پچێتە زیارەتی ئەوزاتە خوا بە ئاواتی خۆی دەگەیەنێ.هەر لە بەرئەمە ساڵان لە ناوچەی سەقز بە تایبەتی لە گوندەکاندا هەر ژنێک بەوجۆرە منالی ببوایە ئالقەی غولامی شێخ حەسەنیان لە گوێچکەی منالەکەدەکرد .ئێستاش زۆر، لەوژنەنەزۆکانەی جنووبی کوردستان بدمورادی بە ئاوات گەیشتن ومنال بوون رووەدەکەنە بارەگای شێخ حەسەن .

ئەوەی پێشان دەدا وادیارە شێخ حەسەن هاتوچۆی شاری سەقزیشی کردووە چون لە گەڕەکی ناوقەڵای سەقز مزگەوتێکی جوان ورازاوەهەبە کە بە مزگەوتی دوومنارە یان مزگەوتی شێخ حەسەن بە ناوبانگە .ئەم مزگەوتە بە خشت وئاجوری سوور دروست کراوە وهەروەک میعماری دەورانی سەفەوی وئەفشاری یە بە کاشی رەنگاوڕەنگ سەر دەرگاکان ومنارەکانی رازاوەتەوە ووەک دەگێڕنەوە بناغەی ئەم مزگەوتە بەدەست شێخ حەسەن دانراوە وکارشناسانی رێکخراوی باستانشناسی ئێرانیش مێژووی کۆنی مزگەوتەکەیان بەراست زانیوە .لەسەربانی ئەم مزگەوتەدا رۆچنێک هەیە کە خەڵک پێیان وایە نەزەر کەردەی شێخ حەسەنە وهەر منالێک پێ نەگرێ یان درەنگ پێ بگری لە پاش نیوەڕۆی رۆژانی چوارشەمە تاسێ جاران دەیبەنە سەربانی مزگەوت و لەو کونەوە تاناوقەدی شۆڕی دەکەنەوە بۆخوارێ ودەڵێن بەم چەشنە منالەکە پادەگرێ جگە لە کەرامەت وخەواریقکە

باسمان کرد شێخ حەسەن زاتێکی حەسابزان یان بە وتەی ئەمڕۆ (ریازی زان)بووە وبۆخۆی تەقویمێکی داناوە کە زیاتر بۆکشت وکاڵ دەبێ ولە گوندەکاندا زۆربڵاوە و بە حەسابی شێخ حەسەن ناوی دەرکردووە. بە پێی ئەم حەسابە وەرزی زستان پەنجا رۆژە واتە بیست رۆژ لەم سەرو بیست رۆژ لەوسەری زستان قرتاوە.ئەوەیە کە دێ نشینەکان لەناوەڕاستی زستاندا دەڵێن خوایا ربێ بە حەساوی شێخ حەسەن زۆری نەماوە بۆبەهار...جگە لە تەقویم یان رۆژئەژمێر لە مزگەوتی باشماخی تیلەکۆ بەردێک دانراوەکە دەڵێن کاری شێخ حەسەنە.ئەم بەردە بووە بە سەعاتی ئاوایی و بە پێی حەرەکەتی تبشکیهەتاو لەسەر بەردەکەنوێژی نیوەڕۆو ئێوارە مەعلووم دەکرێ.

سەرمەزاری شێخ قورعانێکی لێ یەکە پتر لە ٨٠٠ ساڵ، لەمەوپێش لە دیمشق نووسراوەتەوە وبە قورعانی شێخ حەسەن بەناوبانگە وکەڕاماتی زۆری لێ دەگێڕنەوە.لە پشت ئەم قورعانەدا مۆری تایبەتی شێخ حەسەن هەیە کە نووسراوەی مۆرەکە بەم جورەیە:

**گەر بدلوتفی ویت ببەخشی حەسەن حەسەنات مەبو حەسەن های حەسەن**

لە پشتی کتێبێکی دلائل-

الخیراتدا چەن شیعرنووسراوە کە شیعری ئەوزاتەن وەکوو ئەم شیعرانە:

بروای اشک ازآن گلرخبیاور آرزوی من
وگرنە ازتومیونجم میادیگر بروی من
میکشد چشمتوازگوشەبە میخانە مرا
میکشد زلف چوزنجیو تو دیوانەمرا

**هەر لە پشتی ئەودلائل**

الخیراتەدا وەفاتی شێخ بەم چەشنە نووسراوەتەوە:
تاریخی وەفاتی حەزرەتی قطب العارفین شێخ حەسەنی مەولانا واشەوی پێنج شەمۆو بیست وپێنجومی سەفەر سالی ١١٣٦ هجری قەمەری.

بەداخەوە ئاڵوگۆڕی زەمانە وبایەخ پێ نەدانی سەوادداڕەکانوباروودۆخی تایبەتی کوردستان لە هەموو ئەم چەشنە کارانەدا واخۆیان نواندووە کە شوێنەواری زانایانی ئاوا مەزن وکارئامەد بکەونە گێژاوی فەرامۆشی وببنە خواردەمەنی مار و مێروو دەنا ناگونجێ پیاوی وەک شێخ حەسەن شیعر و دەفتەر ونووسراوەی نەبێ بەڵام چی دەکەی لەچارەڕەشی کوردی هەژاری بێبەش؟ کێ بووە یان کێ هەیە شوێنەواری زاناکانی بپارێزێ؟

ساقیا! ئاوردەوە، ئاورِ دەوە
کۆی بزووتی هەست و بیرم گردەوە

بابەرەو دەریای شیعری روون بچم
جا بسووتێم وبەرەو هەربوون بچم

گرِ لە گیانم بەردە بمکە ژیلەمۆ
تا بزانم چارەنووس بۆوا یەبۆ؟

هەر دەبێ دیلی شەوەی شەوگاربم
نابێ یەک‌دەم من لە خەم رزگار بم

وابزانم خەم لە گەڵ من هاتەدی
بۆیە تا ئەمرۆ دەمێ خۆشیم نەدی

خەم وەها ئۆگر بە گیانی من بووە
رایەڵ وپۆی بوون ومانی من بووە

وەک جلە و مالۆ چە خەم هالاوەلێم
رێی بزە وشادی و ئەوین بەسراوەلێم

برکە مردووی سیس وژاکاوم ئەمن
درکی ویشک وبەردە سووتاوم ئەمن

ژینی وەک من سۆزی زریانی خەمە
مەرگە، مەرگێکی درێژو کەم کەمە

رێم نیە تاوێکی رەگ ئاژۆ بکەم
هەر لە دەوری خۆم دەبێ خەم‌کۆبکەم

* *

ساقیا بێچارە خۆم،بێچارە خۆم
چاو لە دەست وچاوەرێی ئیحسانی تۆم

تێکە بۆم،بروانە کاروباری دڵ
سابە گوێی دڵ بژنەوە هاواری دڵ

دڵ مەلێکە باڵ شکاوی دەردەدار
بێ پەرِوپۆی بێ هومێدی بێ قەرار

چۆن بکەم باسی دڵ و هاواری دڵ؟
کوانێ کێ دێت ودەبێتە یاری دڵ؟

کوانێ یاری دڵ؟ ئەوی دیم هەونەبوو
چاری شێوانی دڵی من بەونەبوو

"هر کسی از ظن خود شد یارمن
وزدرون من نجست اسرار من (۱)

هەرکەسێ دێ بەندی دڵ دەپسێنێ لێم
خوێن دەنۆشی و جامی دڵ دەشکێنێ لێم

نایە تا باسی دڵی خەمبارکا
تێدەکۆشێ تا لە دڵ خەم بارکا

کەس‌نیە گوێ داتە هاواری دڵم
کەس‌نیە کەم کاتەوە باری دڵم

چوومە لای نەی دیم کەئەو خۆی بێدڵە
گەرچی بنچینەی دڵ و نەی هەر گڵە

بێدڵە نەی،بێدڵ وهاواری دڵ؟
بێدڵ و دەردی دڵ وئەسراری دڵ؟

"مشنو از نی نالەاش از بیدلی است
نالە بیدل یقین بی حاصلی است
مشنو ازنی، نی نوای بینواست
بشنو از دل،دل حریم کبریاست

هەر دڵە وئاگای لە حاڵی دڵ هەیە
هەر دڵە وڕێگای بە ماڵی دڵ هەیە

* *

ساقیا! نازدارەکەم! دڵدارەکەم!
ئاشنای رۆژی رەش و شەوگارەکەم!

ئاسکی دڵ ناسکی خۆش‌رەوتی من!
گوێ بدە دەردی دڵی نەسرەوتی من

تۆبە دەردم‌ئاشنای دڵ ناسەکەم
ئاشنای ئاوات و هیواو تاسەکەم

" آشنا داند صدای آشنا
آری آری جان فدای آشنا (۳)

سەردەمێکی ئەم دڵەم پرتین بوو
جێی پەرەستێن وئەوین و ژین بوو

ئێستێ بۆتە دیلی شەمزان وکەسەر
چۆن دەتوانێ خاوەنی ژین با تەسەر

کوێرە ئەستێرم لەبەرتیشکی هەتاو
ویشکە سوێمە،سوێم نەما بۆچۆڕێ ئاو

خێرخوایەک کوا بە جامی ئاوی روون
ئەم هەلەش بمداتەوە مەودای بوون

تا بخولقێنم دوایین شینی دڵ
وێکی نێم ئەمجا کتێبی ژینی دڵ

* *

ساقیا رووم تێکەوە، رووم تێکەوە
با بگێڕین گەرمەشینێ پێکەوە

باوەفاکانم کوان ؟ ئێستێ لەکوێن ؟
تا بکەین سۆرانی شین و مل بەکوێن

تا بە سەر داکەین خموخۆ نێینە هەش
چونکە ئاوابوو لە ئێمە رۆژی گەش

تێکدرا ، خاپوورکرا رووگەی ئەوین
شادی ئاوا بوو لە بستووگەی ئەوین

* *

ساقیا بۆم تێکە بادەی ئاگرین
سەیرە دارو بەرد لەگەڵ من ناگرین

من لەژێر دارێکی رووتی بێ گەڵام
بێ هومێدم ، ئێستێ ئامانجی بەڵام

کوانێ هێمن تا بە شیعری ئاگرین
تین بدا ئاورگی کووژراوەی ئەوین

داخەکەم هێمن نەما ، هێمن نەما
شووشەی ئاواتم شکا ، پشتم چەما

شاعیری ئۆگر بە هەڵدێر وکەلان
هاودەمی لێڕ و کەژ و دوندوتەلان

ئاشقی شەوباوشەو ، بۆشەوگەڕی
ژینی پێوا تا گەیشتە ئەوپەڕی

کۆچی کرد و رۆژی رەش بۆ ئێمە ما
ئەونەما ، هیوا نەما ، خۆشی نەما

چۆل بری دەشتی رەقەن خۆی راشەکاند
تۆزی ماندوویی بە یەکجاری تەکاند

ئاخۆ ئێستێ هەڵز و بیزا و کەما
چون دەگێڕن شین لە بستوو وئەستەما ؟

ئێستێ مەندۆک وگیاخاوو کەنێر
سوێسن و بەیبوون و شەوبۆ و شلێر

سیس وژاکاون کە خاڵی بوو هەوار
تێک شکا ئەستوندەکی تاوڵ و دەوار

تازەکوا ئێوارە پاییز لێڕ و کێو
زەردەیان بۆ زەردەیەکی دێتەلێو ؟

یا لە دارستان کە مانگ هەڵدێ لەسوێ
کوا لە مەل ناڵەی جودایی دێتەگوێ

سووڕی دەورانە کە ئێمەی تێک شکاند
داخی یارانە کە جەرگی مەی چزاند

رەمزی بوونم "سروە"یەکە جاروبار
دێت و بۆم دێنێ بەرام وبۆنی یار

* *

خاکی رەش میوانی تۆیە هێمنم
ئەو کەسەی نووزەی بە ئاستەم دێ منم

واخەریکم شین دەگێڕم رۆژ و شەو
لێم حەرامە پاشی هێمن خورد و خەو

قەدری بگرە،توند لە ئامێزی گرە
هێمنە وپاشی نەمانیش دڵگرە

کۆچی دوایی کردشکاندی پشتمان
مات و رەش پۆشین ئەوێستێ گشتمان

ئارەزوومە گیان لەلەش ئازاد کەم
بێمە لای و خزمەتی ئوستاد کەم

باوەفام وسپڵە نیم ئوستادمە
بۆیە دایم هەر لە بیرو یادمە

تا بزانێ هەر وەفادارم ئەمن
لێرە بێ ولێرە نەبێ یارم ئەمن

بۆمنیش جێیەکی رابگرە لە لای
دێمە لای و دێمە لای ودێمەلای

# ڕەخنە و

نیە لە مومکینێ ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بە غەیری خاجەیی دیوانی ( عالم الاسما )

لەم بەشەدا کە زۆریش سەرنجی خوێندەرانی بەڕێزی ڕاکێشاوە دوو مەبەستمان لەبەرچاوە : یەکەم: ئەوەی کە بە هاوکاری هەموو خوێنەرە بەئەمەکەکانمان هەڵەی ژمارەکانی ڕابردوو ڕاست بکرێتەوە . دووەم : پێشنیاری خوێنەر بە هەموو ئەو کەسانەی کە بۆسروە دەنووسن یا دەیانەوێ بنووسن ڕاگەیەندرێ . لە ڕاستیدا ئەم لاپەڕە دەبێتە هۆی پەیوەندی گرتنی خوێنەرانی سروە و ئەو نووسەرانەی لە دوور و نزیکەوە شت بۆ سروە دەنووسن .

گوندی قوزلویی چووک : کاک ڕەحمانی حاجی

١- لە ل ٢٩ پاراگرافی ٢ دێڕی ٣ نووسراوە :

" لە دەشتی ڕەواندووزی لە بۆڵە بەرانان" ،بۆڵەبەران نیە ،ئەوە "مۆڵەبەران"ە بە مانای جێگا و هەوشەی بەرانان .

٢- لە ل ٨٠ کەرتی سێهەم دێڕی ١٤ نووسراو:

نەیدەهێشت خوشکەهەتیوەکانی .....

منداڵی بێباب سەخیرە ، منداڵی بێدایک هەتیوە....

٣- لە ل ٨٧ کەرتی ١ لە خوارێڕا دێڕی ٤ نووسراوە:

(وەی زریانە هەدێکە ! )

ئەمن ئاوام بیستووە:( وەی زریانە هومێ کە !). یانی ئەی بای زریان هیممەت بکە و ئەو کاغەزە بەرێ کە ، وادیارە ( هەدێکە ) دروست نەبێ چونکە مانای نایە .

سەقز : کاک عبدالرحمنی گوڵستانی

ئەگەر دەکرێ لە هەر ژمارەیەکدا بەکورتیش بووە شتێک لەسەر ڕابوردووی سیاسی میللەتی کورد بنووسن.

وێڕای سپاس لە کاک حاجی هاشمی نانەوازادەگان کە گوڵ و گیای کوردستانی پێ ناساندین،لەو کەسانەی کە دەیانەوێ درێژە بەم کارە بدەن داوا دەکەم بۆ ئەوەی کارەکەیان ناتەواو نەبێ ، وێنەی ئەو گوڵ و گیایانەش بڵاوبکەنەوە .

بانە : کاک تاهیری یوونسی

باوەش کردنەوەی لاپەڕەکانی سروە بۆ هەموو بابەتێکی زانستی وەک مێژوو ،هەروەها فەلسەفە و بابەتەکانی دیکە ، ڕێگایەکە بۆ گەیشتنی سروە بە پلەیەکی بەرزتر لە گۆوارەکانی تر.

مەهاباد: کاک سولەیمانی پووراززەر

لەسەر ئەم بابەتانە بنووسرێ :

١- کایەی لاوان و منداڵان کە بەشێک لە فەرهەنگی ئێمە پێک دێنێ،وێڕای لێکۆڵینەوەی مێژوو و چۆنیەتی کردنی .

٢- پەندی پێشینیان، ئەگەر دەکرێ لەگەڵ ڕوون کردنەوەی چۆنیەتی بەکارهێنانی لە قسە و نووسیندا .

٣- سەنایعی دەستکردوخۆماڵی کوردستان .

٤- شوێنەواری کۆن لە وڵاتەکەماندا ،وێڕای نووسینی مێژووی تایبەتی هەرکامیان.

٥- مەسەلەی بارهێنانی منداڵ و ژن هێنان و کچ بە شوودان .

گوندی نەڵێن:کاک زاگرۆس عاد

بەشی شاعیرانی لاو پەرە پێ بدەن،دەتوانن لەگەڵ بەشی ڕێنوێنی ئەدەبی( کە زۆرتر لەسەر شێعری لاوەکان دەدوێ) تێکەڵی بکەن، یانی لە هەر ژمارەیەکدا چەند شێعر چاپ بکەن و هەرشیعرێک بەجوانی شی بکەنەوە و کەم و کووڕیـ یەکانی دەست نیشان بکەن.

ئەمکارە قازانجی پترە چونکوو لەجوابی نامەیەک تەنیا نووسەرەکەی حالّی دەبێ و بۆ خوێنەرانی تر شتێکی زیادییە بەلام ئەگەر لەگەلّ چاپ شیعرە ـ کەشی بکرێتەوە ،دەبێ بە دەرسێکی ئەدەبی بەکەلّک و سەرنج راکێش.

تەکابی هەوشار: کاک خالیدی راعی

تکایە لە ژمارەکانی داهاتووشدا لەبارەی بێهداشتەوە بنووسن ،چونکوو ولاتەکەمان لەم بارەوە زۆر دواکەوتووە.

تەورێز: کاک سەلاحی جەمیلی

واباشە تەنیا شیعر و پەخشان هەموو لاپەڕەکانی سروە داگیرنەکەن بەلّکوو سەرنجێکی لایەنەهونەرییەکانی وەک تیاتر ،وێنەگەری ، مووسیقاو...ش بدرێ،بۆ وێنە تیاتر و مووسیقا لەنێو گەلی ئێمەدا رەواجی بووە و مێژوویەکی کۆنتر لە شیعر و پەخشانی هەیە.

گوندی نارستی سەردەشت :کاک فتحالله روستەمی

لەسەر خواناسین زنجیرە ـ وتارێک بنووسرێ، تالاوەتازە پێگەیشتووەکانمان فەرهەنگی رەسەنی ئیسلامی خۆیان باشتر بناسن.

سەقز: کاک کەمالّی فەرهادی بانە

لەبارەی ژیانی ژنانی کوردستان و هەروەها رێنوێنی ئەوان بۆ دروستکردنی خواردەمەنی،کاروباری هونەری و ئاکار و رەوشتەوە بنووسرێ.

گوندی کاژێی سەردەشت : کاک سەعیدی رەحمانی

١ـ لەبەر ئەوەی لە رابردوودا خوێندن ونووسینی بە زمانی کوردی لە ولاتەکەماندا قەدەغە بووە و زوربەی خوێندەوارەکانمان خوێندنەوە و نووسینی کوردییان بەلاوە گرانە ،ئەلف وبێی تەواوی کوردی لە ژمارەیەکی سروەدا بلاوبکەنەوە.

٢ـ فەرهەنگۆک لە ئاخری هەر ژمارەیەکی گۆوارەکەدا پێویستە.

گوندی بێژوێی سەردەشت : کاک ف. ئاسۆس

سووچێکی گۆواری سروە بۆ بلاوکردنەوەی فسەبەنرخەکانی پیاو ماقوولان وپسپۆرانی جیهانی عیلم وزانست تەرخان بکەن

سنە :کاک محەمەدسووتانی

سەرنج دان بە شارستانەتی ئێمرۆی کوردودەستکەوت وئاکامەکانی لەچوارچێوەی شیعرو چیرۆک وگوزارشی فەرهەنگیدا پێویستە.

رەخنەوپێشنیار

سنە: کاک سەباح بەرزەنجی

* ....بەلّکوو بۆگێڕانی ئاهەنگ وکۆڕی ئەدەبی لە کوردستانی ئێران هەولّ بدەن.

* وت وو ێژلەگەلّ شاعیرانی لاو چێژێکی تازەبەگۆوارەکە دەدا

* بۆ زمانی یەکگرتووی ئەدەبی نابێ بن لەهجەی هەورامیتان لەبیر بچێ

شنۆ : کاک بەهمەنی رەشیدی

بەیارمەتی زانایانی بەناو بانگ فەرهەنگێکی رێک وپێک وباش بۆ زمانی کوردی دانێن کەبەبڕوای من گرینگترین خزمەتە بە فەرهەنگی کوردی .

تەورێز : کاک خالید دەیلەمی

لاپەڕەیەک بۆ لێکدانەوەی مانای وشەوئیستلاحاتی نامۆ بکەنەوە

سوئێد: کاک کاوەشێخانی

* هەر جارە لەسەرباسێکی مێژوویی کوردستان بنووسرێ .

* کاتێک ئاهەنگ وگۆرانی رەسەنی کوردی دەنووسرێ"نۆت"ی مۆسێقاکەشی لەگەلّ بنووسرێ .

* هەرجارە لاپەڕەیەک بۆ "بەرامبەری زمانی کوردی " تەرخان بکرێ .

* لەسەر چلۆنایەتی رابواردنی ژیانی ئابووری خەلّک بنووسن .

# فۆلكلۆر چیە؟

**وتووێژێك دەگەڵ عەلی خزری**

پرسیاری ١: پێمان خۆشە لەبارەی فۆلكلۆرەوە قسە بكەی . فۆلكلۆر یانی چی ؟

وەڵام : باس كردن لە فۆلكلۆر شتێك نیە كە بكرێ لە چەند رستە ولاپەڕەدا بگونجێ جا مەگەر زۆر بەكورتی باسی بكەین . **فۆلكلۆرزانستێكی تازەونوێیە كەبریتی یە لە زانست وبۆچوون وباوورەسمی كۆمەڵایەتی نەتەوەیەك، ئەو ئەلف وبێ یەی كە پێی ژیاون وپێی دەژین و هەموو بوون و مانی خۆیان لەودا دەبینن**

لەبارەی فۆلكلۆرەوە وتوویانە: **فۆلكلۆریانی ناسنامەوناسێنەری نەتەوەكان ـ تەواوی نەتەوەكان بە فەرهەنگ و فۆلكلۆری خۆیانەوە دەناسرێن یانی بۆ هەڵسەنگاندنی هەمووبارێكی ئەخلاقی كۆمەڵایەتی ،نەتەوایەتی ، رووحی،سیاسی ،ئابووری ، و هونەری و ... فۆلكلۆری ئەو گەل ونەتەوەیە نوێنەرەو دەخرێتە لاتەرازووی پێوان و هەڵسەنگاندن .** هیندێك بە داخەوە مانای فۆلكلۆر زۆر بەرتەنگ ترو تەسك تر لێك دەدەنەوە و **لایان وایە فۆلكلۆری هەرگەلونەتەوەیەك یانی هیندێك "ضرب المثل" پەندی پێشینیان وچەند باوورەسمی كۆن ونوێی نێو خەڵك لە حالێكدا رەنگە ئەو مەبەستانە لەچوارچێوەی فۆلكلۆردا ئەوەندە چكۆڵەبن كەهەر وەبەرچاویش نەیەن . یانی فۆلكلۆربەرادەیەك لە ژیانی ئینسانەكان وبەگشتی لەژیانی گەل ونەتەوەكان دا شوێنی هەرساتەوهەرەكاتەی هەیەكە بێ ئەونا توانێ بژی گەل ونەتەوەیەكی رابردووی ، خۆی،دەسكەوتی تەمەنێك و ساڵەهای ساڵ فەرهەنگی خۆی نەناسێ وفەرامۆشی بكا دەگەڵ ئادەمیزادێكی كە بە شوێن زەبرێكی مێشكی رابردووی خۆی لە بیربردۆتەوە هیچ فەرقێكی نیە .با هیندێك لەوەش بچینە پێش تروبڵێین فۆلكلۆر بەومانایەی خۆی كە رۆژ دەگەڵ رۆژا بەربڵاوتر دەبێ،یانی كورت كراوەیەك كورتەیەك لە ژیانی ئابووری كۆمەڵایەتی،سیاسی،مێژوویی رەوان ناسی،زمان ،هونەر باوورەسمی كۆمەڵایەتی تایبەتی یەكانی كەسایەتی نەتەوایەتی و...زۆرشتی تر كە رۆژ بەرۆژ و هەر رۆژ لە رۆژی رابردوو زیاتر باری تری لێوەدەر دەكەوێ و ئەو زانستە هەراوتروبەربڵاوتر دەبێ وفۆلكلۆر بەو مانایەی كە باسم كرد بەر لەئینسان لەگەڵ ئینسانە هاورێ یەتی تا مردن وپاش مردنیش .**

**فۆلكلۆر زانستێكە ،دونیایەكە هیچ شتێك نیە لەوچوارچێوە بێ سنوورەدا نەگونجێ راستەو خۆ پێوەندی بە ئەوەوە نەبێ.**

كاتێك بۆوێنە دەڕوانی یە بەشێك لە فۆلكلۆری كوردی ومەسەلەن سرنج دەدەیە بەیتێك ،لە هەستان و دانیشتنەوە ،لەرۆیشتنەوە ، لە دوانەوە ،لەمەرج وقەول و پەیمان و بەڵێنی وتۆران و ئەویندار ی ومردن وشەڕو ئاشتی وسەركەوتن وتێ شكان وخواردن ولەبەركردن وزمان و وشەی جوان ورەسەن و شیعر و هێزی خوڵقاندنی هونەری و باری ئابووری وكۆمەڵایەتی ورووحی وئەخلاقی ومێژوویی و مۆسیقی وئیستلاحات و"ضرب المثل" وچوارچێوەی زمان و ... باس لە هەموو شت دەكا كامیان لەوانە شیلوی لێ وردبوونەوە نین ؟ كامیان دەسكەوتێكە كە شەخسی یەتی نەتەوەیی نیە ؟ چ گەل ونەتەوەیەكە شانازی بەو خەزێنە بایی دارە نەكا ؟

تورك تەواوی باری رووحی خۆی،باری ژیانی خۆی بەو بەربڵاوی یەی كە عەرزم كردی،

لەوانەیە مەسەلەن لە
کۆیئۆغلێ بۆتورک یانی
مەودایەک بۆ دەردی دڵ کردن،
نەقڵەکانی مەلا نەسرەدین
یانی دەرفەتێک بۆخەڵکی
زوربەی وڵاتانی ناوچەی
رۆژهەڵاتی ناوەڕاستکە خەم
وخەفەتیلان بتارێنێ.هۆرە لە
ناو جاف وهەورامانی یاندا
یانی هاوارێک کە هەموو
کۆت وبەندێکی دەست وپێ گیر
بپسێنێ وئادەمیزاد بۆ
ماوەیەکی هەر چەند کورت و
کەم تەنیاخۆی بێ وخۆی
تەخلیەی رەوانی بکاو
ئادەمیزاد بە تەنیاو گەل و
نەتەوە بە گشتی ناتوانێ
خەمێک بەسەر دوێنێ وساتێک
لەمەوبەری دابنێ وبێ نیازبێ
لەو خەزێنەبایی دارو دەسکە
وتەی کە هەزاران ساڵ بە
نرخ وبایی هەزاران سەرکەوتن
وتێ شکان وەدەستی هێناوە و
لە خوێنیدا پاشەکەوت بووە
وبێ ئەوەی خۆی بزانێ
پێ یەوە ژیاوە .دەڵێن :
ئەسکەندەر شاخی هەبوو
ئەو شاخەی لە هەموو کەس
دەشاردەوە سەرتاشەکانی
بە هۆی درکاندنی ئەو رازە،
سەیوە پاش ماوەیەک دەکوژران
خەڵک بەو باسەیان نەدەزانی
ەتا رۆژێک نۆرە گەیشتە
سەرتاشێک کە چاوی بە
شاخی ئەسکەندەر کەوت زۆری پێ
سەیر بوو بەڵام ئەسکەندەر
هەڕەشەی لێ کردکە درکاندنی
ئەورازە یانی کوژرانی خۆی
ماوەیەک رادەبرێ وسەرتاش
کز دەبێ ولەڕولاواز دەبێو لە
بارێک وبنێسی دەدا کە
نەیدەتوانی ئەورازە بە
قیمەتی فیداکردنی گیانی
بدرکێنێ .رۆژێک چاری نامێنێ
ولە چۆڵ و بیابانێک لە
جێ یەک کە دەنگ وەهیچ کوێ
رانەدەگەیشت یەک بەخۆی و پڕ
بە دڵی هاواری کردئەسکەندەر
شاخی هەیە .

یان ئەو وتەیە کە دەڵێن :
کە خەمێکت لە دڵدا بوو،
یان خەونێکت دیت لەجێ یەکی
چۆڵ بۆئاوی‌رووبارێک یا
چاڵاوێک بیگێڕەوە .

ئەو دوومەبەستە بەشێکن لە
بیروبڕوای کۆمەڵ ئەگەر
زۆرباش سرنج بدەینە ئەو دوو
مەبەستە بەرجی زۆرجێی
بارێک وناسک مەبەستێکی
رەوان ناسی تاکی دێنێتە
گۆرێ کە رەنگە زانایان
هێندە لەمێژ نەبێ پەیان پێ
بردبێ .رەنگە دوکتۆرێکی
رەوان ناس بزانێ مانای
ئەو رووداوەیان ئەم وتەیە
چیە وئینسان لە چ حاڵێکدا
پێویستی بەو کوڵ وکۆرشتنە
هەیە .

رووکردنی وێنەیەکی وا
دەبێتە سووژەیەکی باش بۆ
رەوان ناسێک یا خەڵک
ناسێک کە لێی ورد بێتەوە
وموتالای لە سەر بکا لە
ڕەوان ناسی تاکیدا دەڵێن :
شۆخی وگاڵتەیەکی سەرزارە ـ
کیش سەر چاوەیەکی بڕوایی
هەیە .جابە لەبەر چاوگرتنی
ئەو مەبەستە لە بەیتی لاس و
خەزاڵدا کاتێک لاس پەیاش
**بیستنی جوانی خەزاڵ لە
کابرای دەروێش،تەمادەگرێ بە
سپاو لەشکرەوە بچێ و
خەزاڵ یا بە خۆشی یا بە
شەڕ بستێنێ وردێن سپی و
کەیخودای هۆز ئامۆژگاری
دەکەن : کە ئەگەر پیاوێکت
لە سۆنگەی ئەو کارەوە
خوێنی لە لووتی بێ دونیا
گاڵتەت پێ دەکا کە "لاس"،
سەبارەت بە ئافرەتێک
پیاوێکی بە خەساردا "،کەسێک
لەباری رەوان ناسی
کۆمەڵایەتی‌یەوە بڕوانێتە ئەو
مەبەستە هەرە چکۆڵەیە
"تەنانەت ئەگەر شۆخی و
گاڵتەیەکی سەرزارەکیش بێ "
باری رووحی وئەخلاقی ئەو
گەل ونەتەوەیە بە جۆرێکی تر
دەبینێ سەری لەوە سوڕ
دەمێنێ لە نیزامی فئۆدالی
سەدەیەکی وادووردا کە
مەسەلەن لە رۆم ئینسان و
حەیوانی دڕندەیان بەیەکەوە
بەشەڕ دەداو، وەک شەڕە
کەڵەباب شەڕە گلادیاتۆریان
سازدەکرد، چۆن دەکرێ ژیان
وگیانی ئینسانێک بۆخاوەن
دەسەڵاتێکی وەک لاس ئەوەندە
گرینگ بێ .یا :
کاتێک بەئەحمەدی شەنگ**

**دەڵێن : ئەوە حەوت رۆژە گاڕان ومالّی تۆیان بردووە بە تالان دەست ببزێوە دەڵێ : ئەمن خەمی ئەوەم نیە گاڕان مالّی منیان بەتالان بردووە خەمی ئەوەمەسەری گاوانی منیان بڕیوە وئەوە دەردێكی گرانە !!**

**ئەو مەبەستانە زۆر باریك وزەریفن ئەوە سەری هەودا یەكن بۆناسینی گەل و نەتەوەیەك وهەزاران وێنە و بەڵگەی تر** .بەڵام با وەڵامی پرسیاری تۆ زۆر درێژنەبێتەوە وئەو كورتەیە جارێ بەس بێ كورت وكرمانجی واباشە فۆلكلۆر ئاوا مانا بكرێتەوە،

**فەرهەنگ وفۆلكلۆری كورد یانی نەتەوەی كورد ،فۆلكلۆری فارسی یانی نەتەوەی فارس وناسێنەری هەر گەل ونەتەوە- یەك یانی فۆلكلۆری ئەو گەل و نەتەوەیە .**

**پرسیاری ٢-** لەچ كاتێكەوە هەوڵ بۆ كۆكردنەوەی فۆلكلۆر دراوە؟ بە كورتی ئەو بەشە لە لێكۆڵینەوە لە كەیەوە بۆتە باو ؟

**وەڵام=** نەتەوەكانی تری جیهان زۆر لە مێژە لە گرینگایەتی ئەو مەبەستە ئاگادار بوون وزۆر زووتر لە ئێمە ئەو كارەیان كردووە زۆر زوو ئەو خەزێنەبایی دارە لەبەین دەچێ زۆر زووهەوڵیان بۆداوە وكاریشیان زۆر لەسەر كردووە وئێستاش زۆر یەگورتین هەر خەریكن. بەڵام **فۆلكلۆری كوردی بەداخەوە بە چەندین هۆوبەڵگە زۆركەمی كار لەسەر كراوە. یانی دەتوانم بلێم بەوبەربلاوی ـ یەی خۆیەوە ئەوەی كە كراویشە دیاری ناكا .**

نیزیكەی هەشتاوچەند ساڵ لەمەوبەر پرۆفسۆر ئۆسكارمان رچەی شكاندوو زۆر كورت وكەم ولە چوارچێوەیەكی

زۆر تەسكدا هەوڵی بۆ ئەو كارەداوە تا ماوەیەكیش كەس دڵبەندی بەوكارە نیشان نەداولەم دوایانەشدا لەنێو كورددا جگە لە یەك دووكاری جوانئەو هەوڵەی كە دراوە هیچیان وانین كە باسیان لێ بكرێ بەڵام نیزیكەی دەساڵە لە دەرەوەی وڵات كاری لەسەر دەكەن كە ئەویش هۆیەكەی ئەوەیە تەواوی بارونێوەرۆكی ئەو زانستەمان بۆ روون نەبۆتەوە یا ئەوە كە باری سیاسی ئەوەی هەڵنەگرتووە بۆ وێنە كاتێك لەكوردستانی ئێران راگرتنی هەر كتێبێكی كوردی تاوانێكی گەورە بوو یان لە توركیە بە كورد یان دەكوت توركی كێوی، یا لە عێراق دەبوو هەموو شتێك لە خزمەتحكوومەتدابا وئەوەی سوودی هەبا بۆ كۆمەڵ كەم واهەبوو لە حەوتخوان رزگار بێ ،وچونكە كارێكی ئاوا بەربلاو ـلە توانایی كەسێك ودووكەسدا نیە وپێویستی بەوە هەیە نێوەندێكی فەرهەنگی دەست بەوكارە بكا تا ئێستاش ئەو كارە نەكراوە ئەوەی لە سوڤێتیش كراوە لە كورد ئەوەندە دوورە كە كەس نەیدیوە یان باری سیاسی وی جۆرێكە ئەوەی كە كار لە سەر شتێكی وا بكاتوانایی ئەوەی نیە تەواوی كوردستان بگەرێ وكاری لێكۆڵینەوەكەی لە هەموو بارێكەوە بێ عەیب

وئێرادبێ یا لانی کەم پروکاملّ بێ دەنا کاری ئەو زانایانەی وەک:

**پرۆفسۆرقەناتی کورد و پرۆفسۆر ئاپۆ - پرۆفسۆر جاسمی جەلیل - جەلیل جەلیل جەمیلە جەلیل - حاجی جوندی - عەرەب شەمۆ - چاچان میرۆئەسەد- عەسکەر باکۆ عەسکەرشا میلۆ- زومرودشەفیع ئاوا- ودەیان کەسی تر بە راستی بێ وێنەن .**

**پرسیاری ٣-** لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆری وکارکردن لەسەر فۆلکلۆر وئەو بارانەی لەو چوارچێوەیەدا دەگونجێن تا چ رادەیەک پێویستە ؟

**ولام -** ئەوەی لە بارەی، فۆلکلۆردا گوتم رەنگە تا رادەیەک وەڵامی ئەوپرسیارەت بێ یانی کاتێک **فۆلکلۆر وکەلەپووری نەتەوایەتیمان لە بەرانبەر بوون ومان،چۆن بوون وچۆن مانی گەل و نەتەوەدا دانا ،پێویستی و گرینگایەتی ئەوکارو لێکۆ- ڵینەوەیەش جوان دێتەروو .**

لەوکاتەوە نەتەوەی کورد، هەیە ولەبارەی دانووسراوە وتەنانەت لەوکاتەوە شک دەکەین لەهەر وشەیەک کە وێ بچێ باسی کورد بکا ، ئەونەتەوەیە تووشی زۆرهەڵس وکەوت بووە. جاری وایە بۆ ماوەیەک واوێ دەچێ هەر لە لاپەڕەی رۆژگار پاک بۆتەوە جاری واشە کەوتۆتە شادوندی بووژانەوە ،تەواوی هۆو رەمز و رازی ئەو هەڵس و کەوت ووون بوون وپەیدابوو - نەوە وهەڵەسوون هێنانەوەیە زۆر جوان لەوئاوێنەیەدا کە فۆلکلۆر وکەلەپووری نەتەوا- یەتی یە دەبیندرێ .

وەڵامی ئەوپرسیارانە کە: **بۆفریودراین،بۆفریومان خوارد ،بۆچ سەرکەوتین بۆچ تێ شکاین ،کە برسی بووین چمان کرد ،کە تێر بووین چۆن بووین ، کەی گەیشتینە ئەو ئاکامە "دەستێکی نەتوانین بیبڕین دەبێ ماچی بکەین " کەی بڕوامان وابوو"سەفینەمان لە پشت بێ تف لەبەردیش دەکەین . کەی گەیشتینە ئەو ئاکامە "گوێلکی خەڵکی هەرگوێلەوسارت پێ دەمێنێ "** کەی کوتمان : **"هەر ئەقڵەی لە خەسارێکی" کەی سەری ئەنگووستمان گەزت . کە "ئینسانی ئاقڵ دووجاران لە کونێکەوە مار پێوەی نادا "** کێمان گوتی **:خوزیلەی خۆم خۆش بێ مالّم بۆچیە ، کەی برامان بە نان و کەبابێک فرۆشت ؟بۆمەحموود مەرەکانی، خۆی بە شاعەبباس فرۆشت وخەنجەری لە پشتەوەڕا لە خانی لەپ زێرین دا ،چۆنیان غەزای مەزهەبی پێ کردین و ناردیانین بۆکافرقران، بۆ ئەولادی رمووزنە ودێووجندۆکە بووین ،بۆدایک بەوپلەی بەرزی ئینسانی خۆیەوە ، واسەرشۆڕی کردوگوتی : " هەی رۆڵە سەردڵ خربی باب مردووبی شەودرەنگەبۆ جێ ژوانێ "**،بۆچەوزە گەورەی بۆکانێ بەنرخترین شتی دونیایە بوو**"بۆچاو کالێمان دا بەکلاوی زێڕ"، بۆ کوردی دۆ نەدیوبووین ،چۆن شێری هیچ کات نەبەزیوو بووین ،وهەزاران هەزار بۆو، چۆن و، چ جۆری تر...وەڵامیان تەنیا لە دونیای بەربڵاوەی ، فۆلکلۆردا ،لەوخەزێنەبایی‌دارە دا دەبێند رێتەوە**

**ئایا بە دەست هێنانی کلیلێک کە دەرگای بەرەو نوورمان لێ بکاتەوە ئایا دیتنەوەی ئەلف وبێ یەک کە بەختەوەری بەدواوەبێ، ئایا دانیشتن وبیرلەخۆکردنەوە وخۆناسین وسوود و زیان هەڵسەنگاندن بۆ گەل و نەتەوەیەک چەندە گرینگ و پێویستە ؟**

**ئاشکرایە هەتا دوێنێ وساتێک لەمەوبەری خۆمان نەناسین ،ناتوانین دڵنیابین لەوەی کە ئەو رێیەی گرتوومانەتە بەر رێ یەکی راست ودروستە .ئەگەر خۆمان نەناسین وورۆژێک لە کوێرە رێ یەک ئاوێنەیەک بدۆزینەوە وسەیری بکەین جێی خۆیەتی بلێین :کاکە ببوورە نەمزانی ئەتۆی !!**

## ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

# گەنج خەلیل

وەرە لێلێ ،وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ ..
وەرە لێلێ ...هەفسەد دلێ خودێ
دلێ م بانە گەلەک بانە
گەنج خەلیلێ کورمامێ م لە وەلاتێ
غەریبیان وغوربەتێ گەلەکی نەخۆشە
وەزێ رابم نووینا روو وێخم
کەتکەتی بالێفکا بدەمە پالێ
ئەزێ رابم کەمەرا پشتێ خۆ بشکێنم
بۆ ئەسپێ گەنج خەلیلێ بکەمە نالە

بازنێ خۆ بشکێنم بکەمە هووردە بزمارە
بسکێت خۆ ببڕم بکەمە سەر رەشمە
بەلێ دەست هەوسارە
گەنج خەلیل کوڕمامێ خۆ بینم
سوار بکەم لە کۆمێتێ کە تالە
بەلێ وەختێ کو لەشارێ ئەرزەرومێ
ئەسمەر لی یە داتینە خارە
نەبێژن گەنج خەلیل کورمامێ من
تاقە سوارەکی کوردە چەند بێکار وبارە

ئەمانە..ئەمانە...ئەمانە....هووەی
پاشۆ گەنج خەلیلێ کور مامێ خۆ
ئەز نەمینم لەسەر دونیایێ وەی وەی
وەرە لێلێ وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ
وەرە لێلێ ئەوە گەنج خەلیل
چاوێ خۆ بلندکر ب غەریبی یە دگریا
نەفەسێکە قەلیوونی قایلە
هەفسەد دبێ یارەبی خودێ
ئەزی رابم قەلیوونەکی بۆ کور مامێ خۆ
تێکەم
قەلوونەکە زەرنیشانە دەسکێ
ئەستەمبوولی نیشانە
مۆدنەکە کارەبانە
فەلەکێ دارێ دار جلیتە
بە مشارێ برِی ،بەبرەگێ
قەرانە بینم بۆدار قەلوونا
گەنج خەلیلێ کور مامێ خۆ دانێم
ئەما.... نەئەما...نێ ئەما... نێ
بەلێ بێم کو کورمامێ م
ئەوە هەفتەکەتە سالە
کەتی یە سەر دەستوورا رۆمیا
بە تورکی دەبێژیت بویرون ئەفەندی
قەلوونە لێ تەرا
وەرە ...نەمایێ ...نەمایێ ..نەما ...هۆ
پاشۆ گەنج خەلیلێ کور مامێ خۆ
نەمینم لە دونیایێ
وەرە لێلێ وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ
وەرە لێلێ وەرە لێلێ ...ئەمان ...هۆ.وەی
وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ
وەرە لێلێ ئەزێ قارش میش ناکەم
کورمامێ خۆ ل خەوەکە شیرین راکەم
چەکمەکە عابدی ل پیاکەم
شەلوارەکە شمنتەلی دەلنگاکەم
عەبایە تەمتەلی لە ملاکەم
خەنجەرەکە سالح بەگی
دەبەراکەم .
جووتەکە دەمانجێ شارێ شامێ
دەسەراکەم
ئەزێ گەنج خەلیل ئاغا کورمامێ خۆ
بمە جووتما مەیدانێ شاری راگرم
رۆژەکە مێوانە عوسمانیا ئەزێ دل نادەم
کورمامێ خۆ لە چ دەوارا سووار کەم
ئەزێ بینم خۆ بکەمە ماهینەکە
سەگلاوی خۆ دبن راکەم
گەنج خەلیل کور مامێ خۆ
سەرێ باب وبراکا ودەروجیرانێ
گوندی خۆ د خولامی سەرێ
کور مامێ خۆ کەم
پاشۆ گەنج خەلیلێ کورمامێ خۆ
نەمینم لە دونیایێ
ئەما ...ن ئەما ...ن ئەما .... ن
وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ ...وەرە لێلێ
وەرە لێلێ .....رابم
کارە زینەکێ بۆ کورمامێ خۆ دورست بکەم
سەرزینەکێ بو کورمامێ خو دروست بکەم
کارێ بن زینەکی چێ بکەم ژ مەرجانێ
رکی یابوو بینم ل شاری ئەرزەنگانێ
قایشا بۆ بینم ل قایشا هەمەدانێ
رمەکێ لووتە کووپالێ چێ بکەم
ل دارێ حەیزەرانێ
سەر زینەکی دروست بکەم
کور تووکی پەرێ نعامێ
ئەزێ گولیفگان گولیفکالێ بدەم
شەوقەلی گولە کەوە چاردەی نیسانێ
گەنج خەلیل کور مامێ خۆ دلۆدی
بەمە جووت ماشارێ مەیدانا شامی
بەل خەمێ کور مامێ من زۆر گەلەکن
بلا خەمێ خۆ برەوینیت
دەمدەما پێ بکەتە قلەو زێدەباری
جلیدانێ
ئەما ....ن ئەما ...ن ئەما ....ن
پاشۆ گەنج خەلیلێ کور مامێ خۆ
ئەز نەمینم لە دونیایێ

× × ×

# کڵاوی تەنەکەی وەستابارام

٧

وەستا بارام یەکێک بوو لە هەژارەکانی شاری بانە. بەڵام هەژارێک نەبوو کە دەستی نەداری بۆئەم وئەو درێژ بکا. دەیویست لە رەنجی شانی و ئارەقی نێوچاوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین بکا.

جگە لە پیری ،دەردونەخۆشی سەری لێ دابوو.لەبەر سکی زلی گەلاوگەڵ دەرۆیی.خەڵکی پێ یان وابوو قۆڕە. سەر و چاوو هەموو لەشی بای کردبوو ودەم وچاوی سوورهەڵ گەڕابوو. کە ئێستا بە لای دوکتۆرەکانەوە ئەمانە نیشانەی نەخۆشی (کواشیورکور)ن وبە هۆی کەم بوونی خواردەمەنی ویتامیندارپەیدادەبێ و نەخۆشی تایبەتی برسی یەکانی جیهانی سێهەمە.

دووکانێکی چکۆڵەی میوە فرۆشی بوو کە مناڵی گەڕەک زیاتر لەبەر بیستنی چیرۆک وگۆرانی یەکانی لە دەوری کۆدەبوونەوە ،گوێیان لە قسەکانی دەگرت ومیوە شیان لێ دەکڕی.

وەستا بارام بە سمێڵی سپی وسەری تاسی دەتگوت رەزاشایە.کڵاوێکی شاپۆی فەرەنگی بووکە لە تەنەکە دروستکرابووجارجار لەسەری دەنا ومناڵەکان پێی پێدەکەنین .ئەم کڵاوە (سالحەمیرزا)ی تەنەکەساز بۆی دروستکردبوو کە تەنەکەسازێکی زۆر بلیمەت بوو.

دەیگوت کاتێک سەرهەنگ لەشکری فەرماندەی پادگانی بانە سواری ئەسپەرەشەکەی دەبوو ودەهات بۆ خیابان دوکاندارەکان بەدار لەتای تەرازوویان دەداویەکتریان حاڵی دەکرد.

دەولەمەنەکان کلاووکوت و شلواری ماهووت وگازرۆنیان لەبەردابوو .هەژارەکانیش وەکوو ئێمە کڵاوی تەنەکەیان لەسەر دەنا وبەتاڵێکبەن دە لنگی پانتۆلەکەیان دەبەست.

قاچیان وەکوو لوولە تفنگی لێ دەهات. دەهاتنە بەردووکان وهەروەکوو کارتۆنی تلویزیۆن خەبەردار دەوێستان وجەناب سەرهەنگیش لەم کارتۆنانە (سان)ی دەدی.(نەیاندەزانی کە ئێوانی بەکەللە دەبێ بە ئاقڵ وزانا نەک بەکڵاو).

وەستابارام هەروەها شەڕی مەلاخەلیلی گۆڕئۆمەری بۆمنداڵەکاندەگێڕاوە کە بە شەڕی (کڵاو) بەناوبانگە.

هەروەها شەڕی ئۆمەرپاشای قەلەڕەشەی سەردەشتکە چەپەری شیاکاوی دەرگای ئاغەلی کردبوو بەتەختی پاشایی.

لەوزەمانە خەڵکی چەن دێ بە هاوبەشی کڵاوێکی شاپۆیان دەکڕی وهەرکەس دەهات بۆشار کڵاوەکەی لەسەر دەنا و لە دوواییدا لە جێی خۆی دادەناوە.

هەر کەس پانتۆڵی کوردی لەپێ کردبایە دژبانەکان بە چەقۆ نێفەکیان دەبڕی.

چارشێونوێژیان لە ژنان دەڕفاند .پیاووژن دەبوایە

بە لیباسی فۆڕمەوە بچوونایە
بۆداوەتی پادگانەکان و
قوتابخانەکان وسەیری هەڵ-
ـەڕکێ وسەما .خەڵک دەیان
گوت ئەمە کەی ڕەوای حەقە ؟
(کەچ دانومەریز-شەڵوارمەدارو
بپەرهیز) کێ دیویەتی ؟

هەروەها ژاندارمەکان کە
بە ئەمنیە ناودە-
بران خەڵکی دێیەکانیان
لەسەر ئەوە کە جاجمەکەتان

دەرەجەچوارودەرەجە سێ دەبوو
بەدەرەجە یەک .کلاوی ئەحمەد
لەسەر مەحموود دەکرا وکلاوی
مەحموود لەسەر ئەحمەد. (١)

وەستا بارام دەیگوت :
لەبەرئەم ناهەقییانە بوو کە
برێک لە پیاوی ئازاومایەدار
ڕێگای کێووکەژیان گرتەبەر و
بوون بە چەتە وەکوو (حەمە
تاڵ - سەیدعەتا- خولەپیزە
حسین تاقە) وهەروەها چەند

هەر لەبەر ئەم زوڵم و
زۆرانە بوو کەلە شەڕی دوو-
هەمی جیهانیدا چە رخیش گۆڕا
وبۆماوەیەک خان وبەگەکان
لە شارەکانی بانە وسەقز بە
حکوومەت گەیشتن .بەڵام
ئەمانیش لەوان چاتر نەبوون،
خەڵک چبکەن ؟ جاری وایە لە
تاو مار پەنا بۆئاگر دەبەن.
خانەکان دەستیان کرد بە
تالان وبڕۆ ومال سووتاندن و
پیاوکوشتن .تفەنگچی دەیگوت:

چوارتەختەیە وپێنج تەختەنیە،
ئەسپەکەم لە تەویلە هێلکەی
کردووە ،کوڕەکەت مەشموولە
دەبێ بچێ بۆسەربازی،نانت
بە چەتەکان داوە ،ئازار دەدا.
مەئمووری سجیل ودوخانیاتیش
لەوێ بوێستێ .کە بەپوولێکی
زۆر ناوی کوڕەکانیان دەکرد
بە کچ .(خولە وئەحەومینە)
دەبووبە (خەجێ وئامین و
گوڵچین) یادەبووبەپیرێکی
شەست حەفتا ساڵە . تووتنی

دەستەی تریش.پۆلیسی ئێراق،
وژانداری ئێران دەرەقەتیان
نەدەهاتن .هەموویان لەکون
کردبوون . ئەنگێوەیەکی بە-
دەست و بردبوون .هێلکە و
سیغاریان دەپێکا . پۆلیس و
ژاندارم لە بەریان هەڵ
دەهاتن .جارێک قاچی ژاندار-
ێک لە دەوەن دەگیرێ .ژاندار
تفەنگ فڕێ دەدا ودەس حەوا
دەخا وهاوار دەکا (دەوەن گیان
تەسلیم ،دەوەن گیان تەسلیم )

(هەڵوا دەخۆم ،فڕووجی لەژێر
دابێ )یاناوی کەبابی
نەدەزانی بە ئیشارەتی دەس
باوەشێنی دەکرد ووبەزبان
دەیگوت (لەوهەی دەخۆم لەو
هەی) .

خانەکان شاری بانەیان
هەمووسووتاند دەیانگوت:
وەستا وفەعلەمان لەلەندەنەوە
هێناوە،شارێکی ترتان بۆ
دروستدەکەین . (خواخرابتر
نەدا ،سەدخۆزگەبە کفن دزی هە-
وەڵ) ئێستێ بەعسی فاشیست
خەڵک بە ماڵەکانەوە دەسوو-
تێنێ !

بە شێوەیەکی بڵاو تەقریبەن لە هەموو ماڵێک هەیە. ئەو سەنعەتە دەستیانەی لەم ناوچانە هەن، دوو بەشن، یەکیان **رستن**، ئەوی تریان **کردن** ( **تەنین، – چنین**)ە .

بەرکاری ئەم سەنعەتە**خوری ومەرەز و ... ە**.ئامرازی رستن هەر **تەشیە** بەڵام بۆ کردن ئەو ئامرازەی لازم بێ لەدار و تەختە دروست دەکرێ . کرەکانی سەقز شێوەیەکی سادەیان هەیە ودەکرێ بڵێین ، تەنێ خەڵکی خۆ جێیی دەکاریان دێنن وبرێتین لە :

**پۆپەشمین**ـ ئەم کرە نەوعێک **شەمەدە** بەنەکەی باریکان دەڕێسرێ و دوو تەختە یەو هەردووکیان تێک دەکرێنەوە . بۆ پۆپەشمین زۆرتر **مەرەزی سپی**بەکار دێ چونکە زۆر نەرم و زەریفە .

پۆپەشمین جێ جێ رەنگی جیا لەئی تەختەکەی تێوەدەدرێ ، بەمجۆرە جوانتر دەبێ.

پۆپەشمین زۆرتر هاوینان کاتی حەسانەوەبۆ رەواندنەوەی مێش ومەگەس بە خۆ دادەدرێ .

**بوزوو (شاڵ)**ـقوماشێکە بەلانی زۆرەوە دەسانیمیتر بەرینە و درێژایی چەند میترێک دەبێ . خەڵکی ناوچەی سەقز بەم قوماشە دەڵێن **شاڵ .بوزوو** ، بۆ دروونی **رانک و چۆغەکە** بەرگێکی زۆر جوانی کوردیە بەکار دێ. ئەم بەرگە ئەگەر چاک و تەواو بدروێ زۆر لەبار ورێک وپێکە تەختەی بووزوو بۆتەوەی

سەنعەت

سەنعەتی دەست (دەستکرد)

بەرین بێ و رانک وچۆغەی تێبێ بە پانەوە دەسەر یەکتر دەکرێنەوە .

**بەرماڵ ـ هەمان سەججادە،** یە و دوو تەختە (پارچە ) یە تیک دەکرێنەوە .بەرماڵ میتر ونیوێک درێژە و میترێک وبیست سانیمیتریش بەرینە بۆ کردنی بەرماڵ زۆرتر دوو رەنگی **سپی و رەش یا سپی و قاوەیی** بەکار دێ .

**جاجم ـ** هەر وەکوو بەرماڵە بەلام بەرینتر ودرێژترە و رەنگی جۆربەجۆریشی تێوە دەدرێ . جاجم زۆرتر بۆ دەستەنوێن(**بەستەک**) ئیستیفادەی لێدەکرێ .

**بەڕەیا گلیم :**

نەوعێک رایەخە نەخش ونیگارێکی سادەی هەیە زۆریش بە دەوامە بەلام ، رەواجێکی باشی نیەو کەمتر دە فرۆ شرێ .

**هۆزو عەشیرەتەکانی سەقز و وەزعی جوغرافیایی ناوچەکانیان :**

ئەگەرچی مەبەست لەم عونوانەی سەرەوەتەنیا شەرحێکی کورتی تایبەتەکانی، هۆزو عەشیرەتیسەقزوئەوزاعی جوغرافیایی ناوچەکەیانە بەلامچونکە گەلی کوردهەمیشە ئازایەتی ووەتەنخوازی خۆی ئیسپات کردووە ،بێ جێ نیە بە کورتی باسی پێشینەی مێژوویی و فیداکارییەکانی ئەم

گەلە ئازایە بکەین مێژوو شاهیدە چ پێش ئیسلامەتی چ پاشان ، گەلی کورد بۆ کوژاندنەوەیئاگری فیتنەو ئاژاوەو ئەو بەلا و کارەساتانەی رووی کردۆتە ولاتی کەو ناړای ئێران بە گیان و بەدڵ تێکۆشیوەو بۆ پاراستنی شکۆ وعەزەمەتی، گەڕناسی خۆی نواندووە و دوژمن و نەیارانیلەرزاندووە و تەزاندووە .

ئەم گەلە بوێرەکە لە

رەگەزی ئارییە زەمانێک بەرسینگەی لەلەشکری یۆنان کە رووی دەئێران کردبوو و بری یەوە.کاتێک دە هەزار یۆنانی خەریک بوون لە ئێران بگەڕێنەوە گەلی کورد لە چیا سەخت و رژدەکانی کوردستان وای قارەمانەتی و ئازایەتی نواند کەنەک هەر دوژمنی زۆر بەتوندی تێک شکاند بەڵکە هیممەتی بەرز و نیشتمان خوازانەی

سەربەستی خوازانەی یاقووبی لەیسی سەففاریدا خۆی لەهیچ فیداکارییەک نەبواردووە و ( ساڵی بیست و نۆی هیجری قەمەری)، لە شەڕ دەگەڵ تورکە غوزە وەحشییەکاندا ، تەئسیرێکی زۆری هەبووە ،کاتێک مەغوول پەلاماری ئێرانیان دا ،ئەگەر چی جێگەی ژیانی کوردان چیا و رەوەز و زەرد و ماهـ بووە بەلام ئەو ئاگرە بێئامان و

خۆشی نیشان دا ئەم حەقیقەتە لە قسەی دوژمنانیشدا دیارە و خراوەتە سەر رووپەڕەکانی مێژوو ،بە درێژایی دووساڵان حوکمڕانی و دەسەڵاتداری عەرەبان لە ئێران، گەلێکی لە هەموو گەلەکانی تری زۆرتر وەتەنداری نواندووە و هەمیشە بۆ کز کردنی دەسەڵاتی بێگانان لە ئێران خەباتی کردووە ، گەلی کورد بووە .بۆ نموونە لە راپەڕینی

مالّ وێرانکەرە ئەوانیشی گرتۆتەوە و هەزاران ماڵە کوردی کردووە بە دەستە چیلەی خۆی،ئەمما چونکە نیشتمان خوازی خووخدەیەکی غەریزی و فیتری کوردانە، قەت لەبەر بەهێزترین دوژمنانیش نەبەزیون و نائومێد نەبوون و هەمیشە لە کەمیندا بوون تا دوژمنان لە مەملەکەتی خۆیان دەرپەڕێنن بۆ نموونە،ساڵی ٧١٢ ی هیجری چەند تایەفەی کورد بەسەرکردایەتی بەدروددینی کورد بەشێکی سپای مەغولیان کوشت، کورد لەبەر پەلاماری تەیموریش راوەستاوە و غایەتی ئازایەتی نواندووە،مامۆستا رەشیدی یاسەمی خودای لێ خۆش بێ، لە کتێبی "کورد و پەیوەندە رەگەزی و مێژوویی‌یەکانی" دا دەنووسێ: "... لەساڵی٨٠٣دا ئەودەمەی تەیمورلە بەغداوە دەچوو بۆ ئازەربایەجان، کوردان لە شارەزوور زەبرێکیان لێدا نەیێتەوە..." بە دەوری سەفەویش هەرچەندە زوربەی پاتشاکانی ئەم سیلسیلەیە زوڵم و زۆریان لە کوردان دەکرد بەڵام نەیاندەتوانی چاو لە گەڕناسی و فیداکاری ئەم گەلە بۆ پێشگرتنی هێرشی بێگانان بپۆشن و ئەغڵەب هێندێک سنووری وڵاتیان پێ دەسپاردن تا لە بێگانانی بپارێزن،بەشێکی سپاکەشیان لاوی ئازای کورد بوون، زەمانی شاعەبباسی گەورە، پایەیەکی گرینگی لەشکری ئێران عەشایری موکری بوون. وەختی راپەڕینەکەی نادر و بزووتنەوەی ئازایانەی بۆ وەدەرنانی بێگانەوبووژاندنەوەی عەزەمەتی ئێران، تایفە کوردەکان هیچ چەشنە یاریدە-یەکیان لێ دریغ نەکرد، لە دەوری زەندیەشدا کورد بۆ خزمەت کردن و پاراستنی سەربەخۆیی ئێران،لەجاران زۆرتری خەبات کرد و فیدا-کارییەکی کەم وێنەی نواند. پاش برانەوی حوکوومەتی زەند وەکوو دەوری سەفەوی تووشی بەدرەفتاری و دوژمنایەتی قاجاری تورک بەتایبەتی ئی سەر زنجیرەی ئەو بنەماڵەیانی ئاغامحەممەد خانی قاجار بوون سەرەڕای مەملەکەت دەستی نیازی بۆ ئەم قەومە رەشید و وەتەن پارێزە درێژ کرد،سەروکێکی کورد بەناوی سادقخانی شکاک بە پیاوەکانییەوە رەگەڵ سپای "دامەزرێنەری قاجارییە" کەوت بۆ بنەگرتوو کردنی دەسەڵاتی قاجار و لەناوبردنی دوژمن و نەیاران کۆمەگێکی زۆری کرد،بەکورتی ئەم گەلە بەدرێژایی مێژووی ئێران، هەمیشە بۆ قایمکردنی بنچینە کانی عەزمەتی ئێران و پاراستنی سەربەخۆیی ئەم وڵاتە، گیانی خستۆتە سەربەری دەستولە مەیدانی شەڕدا لە بەر دوژمن راوەستاوەوخوێنی رژاوە.ئێستاش پاش رابردنی چەند قەڕنان داب ورەسم و خوو وخدەی ئێرانی یە-کانی باستانی بەرنەداوە و پەیوەندی خۆی لەگەڵ

ئەمە ئاغا محەمەدخانیش وەکوو هێندێک شای سەفەوی بۆ سەرکوت کردن و لە نێو بردنی یاغی و دوژمنەکانی ئێران و گەلانیتری ئێران پاراستووە،ئەمرۆ بەشێکی ئەم گەلە شارنشینە و بەشێکی دێنشینە و بەشێکیتریشی ژیانی

عەشایریان هەیە ،والەخوارەوە باسی عەشایری سەقز و وەزعی جوغرافیایی ناوچەکەیان دەکەین:

**عەشایری دەوروبەری سەقز**

بەگشتی عەشایری دەوروبەری سەقز بەتەرتیبی ژمارەی نفووسیان بریتیین لە :

**١ -فەیزوڵڵا بەگی**
**٢-تیلەکۆ ٣- سەرشیو**
**٤ -گەورک -عەشایریخوڕخوڕە**

**فەیزوڵڵابەگی** :گوندستێن (**دهستان**)ی فەیزوڵڵا بەگی شامیلی بەشی ڕۆژهەلات و باکووری ڕۆژهەلاتی سەقزە و لە ڕۆژهەلاتەوە بە چەمی (**سارووخ**)ی خاکی هەوشار و بەشێکی تێلەکۆوە نووساوە و لە باکوورەوە پاڵی وە ناوچەی فەیزوڵڵا بەگی مهاباد داوە و لە ڕۆژاوا- شەوە بەشاری سەقز وڕێگەی ئیسفالتی (**سەقزبۆ تەورێز**)ەوە نووساوە و لە جەنووبەوە بەشێکی خاکی تیلەکۆوە یە کاری گرینگی خەلکی گوندەکانی ،کشت و کاڵە بە تایبەتی چاندنی **گەنم و جۆ و تووتن** و ڕەنێوهێنانی میوەجات . لە هێندێک گوندی، کالەکی زور چاک و شیرین ڕەنێو دێ .

**تیلەکۆ** - گوندستێنی تیلەکۆ لەنێوان گوندستێنی کەرەفتوو و فەیزوڵڵا بەگی و خوڕخوڕە هەڵکەوتووە .

عەشایری تیلەکۆ دووتایفەن (دونارو هەمەوەیسی)کاری عومدەیان چاندنی نۆک وگەنمو تووتن چەقاندنە. هێندێکیان خەریکی ئاژەلداریــن هەندێک لە گوندەکانی تیلەکۆ نێوەندی ڕەنێوهێنانی تریێ زۆر چاکن.

**سەرشیو**-گوندەکانی سەرشیو کەتوونەتە جەنووبی سەقز و لەڕۆژ هەلاتەوە بە خوڕخوڕە و لەڕۆژاواوە بە گوندستێنی گەورک وبەشێکی گوندەکانی دەورەی بانەوە نووساون . ئەم گوندستێنە لە جەنووبەوەتا (**کۆتەڕەش**) سنووری ئێرانی گرتۆتەوە عەشایری سەرشیو دووتایفەن **وەکیلی و سولتانی** .

**گەورک** - گوندستێنی گەورک دووبەشە .بەشێکیان ناوی هەر گەورکەو ناوی ئەویتر گوندستێنی (مەرخوزی)*یەو بە گوندستێنی **سەرشیو و گەورکی مەهاباد** و نەمەشیو (**شوێ**)ی بانەوە نووساوە . ئەم گوندستێنە ڕۆن و خوری چاکی هەیەو زور بەی عەشیرەتەکانی مەڕدارن .

**خوڕخوڕە** -کەوتوتەنێوان گوندستێنی تیلەکۆو بەشێکی خاکی **مەریوان وسەرشیو** .بەلای ڕوژاوادا پاڵی وە (**میشیاو**)ی خاکیعێراق داوە . عەشایری **خوڕخوڕە** پێنجتایفەن : ١ -**سولتانی** ٢ -**شاپەرست** ؟!!! (**رخزا دی**) ٣- **کەڵهوڕ** ٤ **شێخەکانی مەولان ئاواو بست** ، ٥ -**گەلاڵی** . کاریعەشایری ئەم ناوچەیە زۆرترمەڕداری یەو هێندێکیانیش کشت و کاڵ دەکەن.

# هەواری شیعر

## شاری خامۆشان

ع. حەسەنپانی

تاقە کووچەی شاری خامۆشان ،
خۆڵە پۆتینێکی نەرمە ،
قرچە قرچی نیوەڕۆی هاوینە ،گەرمە ،
چۆڵ و بێ ئاوایی یە ،
زۆر لە مێژە هات وچۆی تیدا نیە ....
ئەمنی ڕێبوار ،
ئارەقەم تک تک لە ڕوومەت دێتەخوار ،
دەیکوتم ماندوو و شەکەت ،
دەچمە پێشێ،
خۆرەتاو دنیا دەسووتێنێ دەڵێی گیا نمدەکێشێ
جێگە پێ یەک ،
جێ دەمێنێت ودەبێتە نەخشی ڕێیەک ،
ڕێیەکی سووتاو بە تیشکی داخ وگەرم،
خۆڵە پۆتینێکی نەرم....

*

ڕێزە ماڵێک دێتە بەرچاو :
تۆز لەسەر نیشتوو ،
لە دەس چوو ،
دەرک ودیواری بەسەریەکدا ڕمیو ،مردوو ،
ئاخرین ماڵ :
کاول وویران و ڕووخاو ،
چاوەیەکی نیوەسووتاو ،
دارو کاریتەی شکاو ،
باخچەیەکی ئیشک،بێ گیا ، تێک دراو ،
جۆگەلەی تینووی دڵۆپێک ئاو ،
چۆڵ و بێدەنگ ،
مات وبێ ڕەنگ ،
دەرکی ژینی داخراو ،
سەردەمێکی کۆشکی ئاواتی منی ئاوارەبوو .

*

تاقە کووچەی شاری خامۆشان ،
خۆڵە پۆتینێکی نەرمە ،
نیوەڕۆی هاوینە ، گەرمە ،
شوێنی پێیەک ،
نەخشی ڕێیەک ،
یادگاری ئاخرین میوانی شارە ،
دوور....کوندێک خەم دەخوێنێ :
ئاخۆ لەم ڕێگایە کێ ڕێبوارە ئەمجارە..؟

*

قوربان وەرە قوربانە سا بمکە بە قوربانت
ڕەنگین کە بە خوێناوم کاکۆڵی پەرێشانت

ئازادیە ئەم ڕۆژە سا فەرموو بە ئازانە
تیرت لە کەمانت خە بۆ قەتڵی شەهیدانت

( حەریق )

قەت لەژێرباری ژیانا دەرنەچووم پیاوانە مام
ڕەنگی زەرد وپشتی کۆمم شاهیدە بۆمووددەعام
شەرتە باری ژین بەسەربەرزی هەتا مەنزڵ بەرم
قەت نەترسم،ڕانەوەستم،ڕێگە ببڕم بەردەوام

مووەدەتێکە من گرفتارم بە دەس سەوداتـــەوە
بووم بە داوی چینی زولف و پەرچەمی تاتاتـەوە

«ناری»

## گۆران

# ڕۆڵەی بێ دایک

نە ئاخ لە سینەدا ئەخواتەوە پەنگ
نەفرمێسک ئەتوانێ برژێ بەبێ دەنگ

نەز مان ئەوەستێ لەمە زیاتر
نەقەڵەم وەک لاشەی مردووی ساردوسڕ

نەفام لەجێگای خۆی ئەمێنێ نە هۆش
دیمەنێ من بینیم بەرد دێنێتە جۆش

کێ دایکی ئەتوانێ بێنێتە بەرچاو
بەمەرگی تاقانەی جەرگی هەڵقرچاو

دامابێ لە دەشتێ،هاواری بەکەس
نەگاهیچ..هەرخۆی بێ ومەیتی کوڕی بەس

تماسەیری دیمەنی وەها کاریگەر
کام ویجدان ناداتەبەرنووکی نەشتەر

بەڵام ئاخ ئەوەی من دیمبەمدووچاوە
مەینەتێکی سووکە ئەمەی بەلاوە

بەک دایکی کوڕمردوو،دیمکۆرپەی ساوا
لای مەیتی دایکیا فرمێسک لەچاوا

کەوتبوو بەبێ شیر،بێ لاوانەوەد
ناوجەرگی ئینسانی ئەچووزانەوە

## کوردی

چێشتم ئەمڕۆ ژەهری مارو رووحی شیرینم نەهات
زامی کۆنەم هاتەژان ومەڕهەمی برینم نەهات
من خەممخواردوخەمیش خوێنی جگەرمی خواردەوە
بۆیە گریام چەند بەچەندفرمێسکی‌خوێنینم‌نەهات
خەم سەری لێدا مویا رمقەت سەرێکی لێ نەدام
سەبروهۆشم ڕۆیی وغارەتگەری دینم نەهات
دل دەسووتێ چین بەچین دەشکێتەسەریەکروەک فەنەر
خاوەنی رووی ئاتەشین وزولفی چین چینم نەهات
دیدەوەک هەوری بەهاران خوێن دەگرێینی وسەدای
پێکەنینی خۆنچەیی نەوسەبزەپەرژینم نەهات
گۆی سەرم چەوگانی میحنەت دایەبەرخۆی رایڕفاند
وای عەجەب بۆشا سوار وخانەیی زینم نەهات

تاهیر بەگی جاف

ئەسلی خەزانی هیجرە رسمی زەمانی دوونە
دەردی فیراقی یاران تەقدیری کاف ونوونە
دنیا بەرەسمە وایە بەزمی وەکوو بەڵایە
عەیشی وەکوو جەفایە بادە بەرەنگی خوونە
بێزارە تەن، لەهیجران چاویش پڕەلەگریان
چبکەم عیلاجێ قوربان؟دل عاجزو زەبوونە
شیرینە وەسلی یاران چونکەدەگاتە هیجران
نازانی رووحم ئەمما چەندتاڵوترش وتوونە
لەژێرخەما مەوەستە فەرموو دەست بهێنە
خزمانی شادمانە (طاهر) مات وزەبوونە

# شوکری فەزلی

ئیش کەرووی ئێستێ لەهەورا زەسەرەولێژی نەکەی
بیری دووریشی دەوێ هەربەدوعا ونوێژی نەکەی
گێرە شێوێنێ کەکای کۆنی بەبادا لنە کنت
چاکە هەرلێی خوڕی سەیری دەم وکاوێژی نەکەی

حەیفە چاوی کەجەفا کولە وەژی تێ دەوەژاند
تۆ بەکلچۆکی وەفات عەینی گەلاوێژی نەکەی
سەرەتای ئیش هەموو یەک بوونەئەویش نابێ هەتا
هەربرینێ کەلە دلدا هەیەسا ڕێژی نەکەی
قەومی بێ سەر نیە ئیمڕۆ لەهەموو عالەمدا
دەتەوێ تاجی سەری بی بە هەوا گێژی نەکەی
شا وەکوو شایەکی شەترەنجە لە عالەم ئیمڕۆ
گەورە قانوونە قسەی کورت ئەوەیە درێژی نەکەی

بۆ هەر دەنگێک لە زمانی کوردیدا ناوێکی جیاواز هەیە و زمانەکەمان لەم بارەوە زۆر دەوڵەمەندە. ئەوەی لەم وتارەدا نووسراوە تەنیا بەشێکە لەو بابەتە.

رەنگ بێ لەهەر لەهجەیەکدا ناوێکی جیاوازی تریش بۆ ئەم دەنگانە هەبێ، خوێنەرانی بەڕێزی سروە دەتوانن کەموکووڕی و ناتەواوییەکانی ئەم باسەمان پێڕابگەیەنن و بۆ کامڵ کردنی یارمەتیمان بدەن، خوایاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا کەلک لە نووسراوەکانتان وەردەگرین.

"سروە"

دەڵێن موعجیزەی حەزرەتی سولێمان ئەوە بووە کە بە زمانی هەموو گیان لەبەرێکی زانیوە وقسەی لەگەڵ هەموان کردووە لە دێوودرنج رابیگرە هەتا مێرووولە ومێشوولە.

راستە کە زانینی زمانی ئەو هەموو گیان لەبەرەی خودا خوڵقاندوونی موعجیزەیە بەڵام ئەگەر بیری لێ بکەینەوە زۆر سرنج راکێش و خۆش و کەیف بزوێنیشە، وەرن سەرێک لە باغ وبێستان ودەشت و کێوەکانی ولاتەکەمان بدەین جا لە هەر جێ یەکی ئەو ولاتە پان وبەرینە بین جێگامان کوێستانی زەنوێری کوردەواری بێ یا بێرووون (کەویر) و (قاقڕی) بەشی نێوەڕاستی ئێران بێ، لە قەراخ ئاوەکانی دەریای خەزەر یا خەلیجی (ئاودرگە) فارس بێ لە هەر جێ یەک بێ، وەرن تاوێک گوێ هەڵخەین بزانین چەند جۆرە دەنگمان گوێ لێ دەبێ ولەشەوو رۆژدا، چەند جار مەستی چریکەی بولبول وباڵەو باڕەی بزن و مەڕەکێوی وگمەی کۆترو قاسپەی کەو........ دەبین، خودا پێمان بڵێ و ئەوهەموو جوانی یەمان پێ رەوا ببینێ.

خوالێ خوشبوو مامۆستا هێمن لە سروەی ژمارە ۴و۳ دا وتارێکی جوانی لەبارەی (راوەتاژی)دا نووسیبوو لەودا چەند رەنگ و دەنگی تاژی (تاجی) ناساندبوو هەر ئەو کارە بوو بە هەوێنی ئەوەی کە وەبیر مووسیقای گەرم و روچەروەری کێوودەشت و مێرگەکانی ولاتەکەم بکەمەوە وئەوەی خۆم بیستوومە یا بۆیان گوتووم بیهێنمە سەر کاغەز، بەڵکوو سروەی خۆشەوێست چاپی بکا وببێتە بزوێنێک بۆ خوشک و براکانم هەتا ئەوانیش ئەوەی لە دەستیان دێ ودەیزانن بینووسنەوە وبڵاوی بکەنەوە، بە یارمەتی مامۆستایان وچازانان فەرهەنگێکی پاراو لە دەنگ ورەنگ و.... (هتد) بنووسرێتەوە.

تەنیا سەر چاوەی زانینمان لەم بارەوە کارەبەنرخەکانی **مامۆستا خاڵ و مامۆستا عەلائەدین سەجادی و مامۆستا شوکروڵڵای بابان و مامۆستا بۆرەکەیی** نەبێ. ئەگەرچی ئەوان زۆریان حەول داوە بەڵام بایەخێکی کەمتریان بە دەنگەکان داوە.

تەنیا **مامۆستا زەبیحی** لە قامووسەکەی خوێدا هێندێکی لەم دەنگانە هێناوە و بەس.

چاکەوابوو ئەگەرئەوان تەنیا ڕچەیان شکاندووە ئێمە پێیدا بڕۆین و نەیەڵین ئەم ڕێگەیە کوێر بێتەوە . شتێکی کە پێویستە بە خوێنەرانی بەڕێزی رابگەیەنم ئەوەیە کە ئەودەنگ نامەیە کەم وکورتی زۆرە .بە بیری خۆم کردوومەتە چەند بەش ولە ڕێزکردن بە پێی پیتەکانی "الف وب )چاوپۆشیم کردووە ،هیوادارم بمبوورن .

١- دەنگی گیان لەبەری چوارپێ دەستەمۆ یا کێوی

بزن = دەهێرێنی (هێڕاندن)
گیسک = دەبێلێنی ( بێلاندن)
مەڕ= دەکاڕێنی(کاڕاندن)
بەرخ = دەباڕێنی(باڕاندن)
کەڵ وگامێش = دەهۆقێنێ ، (هۆقاندن،هۆقە )دەفشقێنێ (فشقاندن ،فشقە ) دەمشێنێ (مشاندن،مشە ) دەهاژێ (هاژان ، هاژە )

گاومانگا = دەهۆڕێنی(هۆڕاندن، هۆڕە )دەبۆڕێنی( بۆڕاندن بۆڕە )دەهاژێ (هاژان)
ئێستر (یستر )= دەزوقێنێ (زوقاندن ، زوقە )
بارگین ومایین = دەحیلێنێ (حیلاندن ،حیلە ) دەپڕمێنێ (پڕماندن،پڕمە )
بەران = دەمرقێنی( مرقاندن مرقە )
وشتر ولۆک = دەلرفێنێ (لرفاندن،لرفە ) دەبڵمێنێ بڵماندن ،بڵمە )
کەروجاشک = دەزەڕڕێنێ (زەڕڕاندن،زەڕڕە )و.........
پشیلە= دەمیاوێنێ(میاواندن میاوە )
سەگ = دەلوورێنێ(لووراندن لوورە)دەنووزێنێ( نووزاندن نووزە ) دەمڕێنێ(مڕاندن ـمڕە ) دەقرووسکێنێ(قرووسکاندن قرووسکە ) دەوەڕی (وەڕین )
گورگ = دەواقێنێ (واقاندن واقە )
بەراز= دەفشقێنێ(فشقاندن فشقە )
ورچ = دەبۆڵێنێ (بۆڵاندن بۆڵە )دەهۆڕێنێ (هۆڕاندن هۆڕە )
تاژی (تاجی) = دەناسکێنێ (ناسکاندن،ناسکە ،ناسکەناسک)
شێر= دەنەڕڕێنی (نەڕڕاندن نەڕڕە )
هەور= دەگرمێنێ

پاشماوەی باسی ئەدەبی ....

بێنرخ شتە سەرەکیەکانی ژیانی کومەڵ هەموو کومەڵ نەک تاکە کەسێک یان بەشێکی بچووکی وەربگرێ لەم سەردەمەدا زۆرجار دەبینین کە شاعیرێک لە کومەڵەکەی خۆی یاخی دەبێ و دژی هەموو کومەڵ رادەپەڕێ،بێ ئەوەی بەشە چاکەکەی کومەڵ جوێ کاتەوە ،لێرەدا هونەرەکەی وی پڕ دەبێ لە رەشبینی و نائومێدی و بێزاری لە ئینسانیەت

لە کۆتاییدا دەڵێین شیعرێک کە تەنیا لەپێناوی شیعردا گوترابێ هەرگیز دەلیلی ئازادی شاعیر نیە بەڵکوو بە پێچەوانە خۆ شاردنەوە و راکردنە لەدەست ژیان کە ئەوەش دروست مانای کۆیلەتی و نەبوونی ئازادی یە

ئازادی هونەری هیچ کاتێک لەخۆبەستنەوە بە کومەڵ جوێ ناکرێتەوە و هەردووکیان پێویستی بۆیەکترو ناتەواوی یەکدی تەواو دەکەن هەر بۆیەش هیچ کاتێک نابێ شاعیرێک وا هەست بکا کە هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نیە و هەرچی بیلێ و نەیلێ ئازادە بەلکوو ئەو مەزن ترین و پیرۆزترین ئەرکی لەسەر شانە کە ئەویش چاوکردنەوەی خەڵکە بۆ ژیان کەواتە وەکوو گوتویانە " شاعیر و نووسەر وەستای بیناکردنی بیر ورای خەڵکن

تەواو

# گەڕانەوەی دەهەزار یۆنانی

"ع بەسەمەدی"

نێوەرۆکی ئەم باسە بریتی یە لە گەڕانەوەی دە هەزار سەربازی یۆنانی بە سەرکردایەتی گزنفۆن(1) لە (بابل)ەوە بۆ مەوتەنی خۆیان، یۆنان.

بەڵام بەر لەوەی بزانین کوردستان لەم بەینەدا چ نەقشێکی بووە وچ دەورێکی بینیوە، باشترە کەبەکورتی و سەرپێیی چاوێک بە سەرجەمی رووداوەکە دابخشێنین وتەنیا لەو وەختەدا بکەوینە شوێن ئەم لەشکرە دەهەزارکەسی یە کەپێ دەنێنە شاخ وکێوەکانی کوردستان وئەم کەوتنەشوێنە پێ بەپێ درێژە دەدەین تاکوو کەوشەنی کوردستان دەبڕن و دەچن دەخاکی ئەرمەنستانەوە ئێمەش لە سنووری ئەرمەنستان را دەگەڕێینەوە.

لەخێڵی مێژوو نووسانی یۆنانی لەمەر سەردەمی هەخامەنشی یەکانەوە (2) سێ کەسیان لەوانی دی بەناو بانگتر ونووسراوەکانیان بەکەلکترە. ئەمانەش (هرودت)(3) و (کتزیاس)(4) و ئەم سێ مێژوو نووسە لەگەڵ هەخامەنشی یەکانها وچەرخ بوون ولەنزیکەوە شارەزایی یەکی تەواویان لە چلۆنایەتی ژیانی ئەوانە هەبووە وکتێبیان لە سەر نووسیون.

لەم بەینەدا گزنفۆن لەوانی دی بەختەوەرتر بووەو هەرچی نووسیویەتی ئەمڕۆ بە تەواو و کەماڵی گەیوەتە دەستی ئێمە . لەکتێبەکانی گزنفۆن ئەوەی لە بابەت مێژووەوە دوابێ و ناوی مێژووی لەسەر بێ چوارن . کەهەر چواریان بۆساغکردنەوەی مێژووی یۆنان وئێران زۆر بەکەلکن :

هلنیکا (۱) ئاگەسیلائوس (۲) سایووپیدیا (۳) ،ئاناباسیس (۴) ئێمەباسی ئەم وتارەمان لە کتێبی چوارەم‌واتە"ئاناباسیس" هەڵبژاردووە .ئەم کتێبە کە بەبڕوای مێژووناسان پڕ بایەخترین کتێبی گزنفۆنەباسی لەشکرکێشی"کووروش" (۵) بۆ سەر برای خۆی " ئەردەشیری دووهەم" (۶)وشکان و کوژرانی کووروش لە نزیکی بابل و لە ئاکامدا ئاوارەوبێ دەسەڵاتمانەوەی دەهەزار سەربازی یۆنانی کە لەسوپای کووروشدا بوون و گەڕانەوەی ئەوان بەرەو یۆنان ، دەکا .

ئاناباسیس بەزبانی یۆنانی بەمانای"سەرکەوتنە" ومەبەست لەم سەرکەوتنە گەڕانەوە لە دەریایە بۆ وشکانی هەر وەکوو لەوشکانی را بۆ دەریا چوونیش دەبێتە (کاتاباسیس" کەبەمانای داکەوتنە " بەڵام ئەم‌کتێبە لەناوئوروپایی یەکاندا بە (گەڕانەوەی دەهەزار کەسی ) ناوبانگی دەرکردووە .

لەسەر تەختی پادشایەتی ئێران کە بەمیرات بەجێ مابوو گێرە وکێشە دەکەوێتە نێوان دووبنەماڵەی ئێرانی.

لەم بەینەدا براچکۆڵە هەڵدەکوتێتە سەر برای گەورە ولەشکرێکی دەکا کەسێزدە هەزار کەسی ئەم لەشکرە بەکرێ گیراوی یۆنانی بوون .

لەشکر لە گردوپەڕی ئاسیای پچووکەوە بەرەو ئێران وەڕێ دەکەوێ ولە نزیکەی بابل ئاگری شەر هەڵدایسێ لە هەوەڵ لێکداندا کووروش وەبەر دێ و لەشکرەکەی سەرکردە یۆنانی یەکانیەک یەک بە دەهۆی دوژمن بەردەس دەبن و دەکوژرێن .

یونانی یە بێ سەرکردەکان وەک لەشی بێ سەریان لێ دێ و دەکەونە بارێکی ئەستەم بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لەم وەختە ناسکەشدا خۆ نادۆڕێنن و بەهاودڵی وهاوزبانی بۆ نەجاتی خۆیان وگەیشتن بە ئامانج سەر لەنوێ سەرکردەی تر هەڵدەبژێرن وبەورەیەکی پتەو بەرەو زێدونیشتمانی خۆیان وەڕێ دەکەون و پێوی هەموو سەختی و دژواری یەک لەخۆ هەڵدەسوون .

لەم گەڕانەوەدا رێگەیەکی‌تر هەڵدەبژێرن وبەرێی خۆیاندا ناگەڕێنەوە .

لەشکر لە ئەوپەڕی رێک و پێکیدا رێگە دەبڕێ وبەرەو پێش دەچێ و لەم بەرەوپێش چوونەدا دەکوژێ ودەسووتێنێ وتالان دەکا . بەڵام کە دەگەنە کوردستان هەردەڵێی ئەو لەشکرەی پێشوو نین .

بەزمان لووسی لەگەڵ خەڵک دەدوێن وچاوی تەماحیان لە ماڵی کەس نیە ،تەنانەت دەس نادەنە پووشکەیەکیش ،خودا خودایانە بەبێ شەڕ وشوور خۆبگەیەننە خاکی ئەرمەنستان کەچی ئەمجار ئەوەکوردەکانن کە پەلپی شەڕیان پێ دەگرن و پێ لەکلکیان دەنێن .

هەرچۆنێک بێ چیاکانی کوردستان دەبڕن ولەمخانەش رزگاریان دەبێ سەیر ئەوەیە بەگەیشتنە لێوی دەریایە ئیدی گەورە و چکۆڵەیی یان نامێنێ ورێزە پتەوەکانیان قەڵشی تێ دەکەوێ .هەندێک پەلەیانە زوو بگەنەوەماڵ ، هەندێکی دی کە گەرەکیانە بەدەستی پڕ بگەڕێنەوە ئارەزووی‌تالان و بڕۆیانەو بۆ گەڕانەوە بەپەلەنین ، و هەندێکی تریش‌لەم بڕوایەدان کە گەڕانەوە و لەژووریخزان چ کەلکی نیە وسەریان لەشەڕ وشووورەدەخورێ . لەم بەینەدا گزنفۆنیش‌کە ئێستا یەکێکە لە سەرکردەکانی لەشکربڕوایەکی هەیە : ئەو( هەلە بەغەنیمەت دەزانێ و دەیەوێ لەمەدەرفەتە بۆ داگیرکردنی شوێنێک لە قەراغی دەریای رەش کەلک وەرگرێ وموستەعمەرەیەک بۆ یۆنان دروست بکا .

ئەمە لەبەختی مێژوو بوو کەسەر کردایەتی ئەو لەشکرە

بکەوێتە دەست کەسێکی نووسەر وئەهلی قەڵەم وەگ گزنفۆن تا کوو هەنگاو بەهەنگاوی رووداوەکان بۆ مێژووتۆمار بکا ولەکتێبی "ئانا باسیس" یا بەقەولی ئوڕووپایی یەکان "گەڕانەوە"دا بیهێڵێتەوە .

ئەم کتێبە لەنێونووسراوە مێژوویی یەکانی یۆناندا بە شتێکی رەسەن وتاقانە دەژمێردرێ .

ئێستا یۆنانی یەکان لە جنووبی کوردستان نزیک دەبنەوە وبێ خەبەرن کە چ رێگایەکی سەخت ودژواریان لە پێشە و دەکەونە چەتەلەسمێکەوە . لێرەڕا واباشترە کە رووداوەکە بەوردی لەزمانی گزنفۆنەوە ببیەین :

" ئەودەمەی کە سوپای یۆنان بەسەرکردایەتی "خئری سۆفۆس" لە کێوەکان داگەڕان کەوتنە دۆڵی دیجلە .واوێدەچوو کە ئاو وگڵ ئێمەی کێشابێتە ئەم مەڵبەندە چونکە لە هیچ لایەکەوە دەرچوونمان نەبوو .سێ رێگەمان لەبەر بوو .یائەوەی لەدیجلەبدەین وبپەڕینەوە ،یا خۆباوێینە کەژ وکێوە بەسامەکان ،یان بەو رێگایەدا کەهاتبووین بگەڕێینەوە . رووومان کردە دیجلە وقووڵایی یەکەمان بەرمبەرپێوا ،بواری نەدەدا . یەکێک لەسەربازەکان گوتی . کوندە با دەکەین وپر دێک هەڵدەبەستین . ئەمەفکرێکی جوان بوو و بۆشمان دەلوا بەڵام سوارەکانی سوپای ئێران لەوبەری ئاو دامەزرابوون ونەیاندەهێشت تەنانەت سەربازێکیش پێی بگاتەوشکانی.

سەرکردەکانی یۆنان، ئەسیرە ئێرانی یەکانیان بانگ کرد تاکووبۆدۆزینەوەی رێگایەکی دەرچوون پرسیاریان لێ بکەن لەئاکامدا زانیمان کە ئەگەر بەرەو رۆژهەڵات بڕۆین کوێستانەکانی ئێران و هگماتانەی هاوینە پێ تەخت و"شووش"ی زستانە پێتەختی شای ئێرانمان لەبەرە ،بەرە و رۆژ ئاواش دەگاتە ئاسیای بچووک وسەر لەنوێ تووشی سوپای ئێران دێینەوە. ئێمەش نەماندەویست چی دی لەگەڵ لەشکری ئێران تێکهاڵێین . کەوابوو تەنیا رێگەی ئێمە هەرباکوور بووکە ئەویش وڵاتی کوردەکان بوو .

ئەسیرەکان پێیان گوتین : ئەم کوردانە زۆر دڕن شاهەنشا جارێک بۆ سەرکوت کردنی وان لەشکرێکی بیست هەزار کەسی ناردە سەریان گشتیان کوشت و تەنانەت چۆلەکە کوێڕان نەهێشتن(٧) . بەڵام ئەگەر بەشەرو لێکدان بتوانن لە چیاکانی کوردستان دەرباز بن دەگەنە ئەرمەنستان کە یەکێکە لە وڵاتە دەوڵەمەندو پڕ نازونیعمەتەکانی شاهەنشاهی ئێران . لەوێشەوە بۆ هەر وڵاتێکی پێتان خۆش بێ رێگە یەک هەیە .

هەوەڵ بازگەی کوێستانەکان لەئێمە نزیک بوو .بریارمان دا بەرلەوەی کوردەکان ئامادەی بەرگری بن خۆ بگەیەنینە ئەم دەرڕەوە و بیگرین ، فەرمانمان بە لەشکر دا کە لەشوێنی پێشوو نیشتەجێ بن و پشوویەک بدەن تاکوو لە نیوەشەودا وەڕێ کەوین .

لەدوای پاڕانەوەوقوربانی کردنێکی زۆر بۆ خوداکان بە تاریکایی شەو دەشتمان بڕی و لەگەڵ کازیوەی بەیانی گەیشتینە هەوەڵ بازگەی کوێستان خئری سۆفوس لەگەڵ تاقمی سووکەچەک پێشەنگ بوون ومنیش سەرکردایەتی پشتی لەشکرم پێ سپێردرابوو ،وسەبارەت بەوەی خەیاڵمان لەپشتی لەشکر تا رادەیەک ئەرخەیان بوو دەستەی قورسەچەک لەپشتەوە لەژێرفەرمانی منداو بوو .

لە دۆڵەکان و داوێنی کێوەکاندا گوندی کوردەکان

دیار بوون کە ئێستا هەموو چۆلکرابوون وبەژن ومندالەوە بەرەو بەرزایی هەلکشابوون وهەرچی هەیانبوو بەجێیان هێشتبوو. ئێمە لە خواردەمەنی هەرچی پێویستمان بوو بردمان وریای لەشکر بووین کەجگە لە خواردەمەنی دەس لە هیچ شتێکی تر نەدەن. هەرچەندە مس و مەسینە جوانەکانیان بۆ ئەوە نەدە بوو چاوپۆشی لێبکرێ بەلام دەمانەویست بەم کارە کوردەکان لەخۆ

رازی بکەین بەلکە ئیزنی ئەوەمان بدەن بەبێ شەڕوشوور وبەتەبایی بە ناویاندا تێپەڕین. لەبەر ئەمە گەیشتباینە هەر کوردێک پێمان دەگوت ئێمەش وەکوو ئێوە بەپادشای ئێران ندتەوین و ئەوە لەشەڕی ئەوان دێینەوە .کەچی هیچ وەلامێکمان لێ نەدەبیستن.

پاشی شازدە سەعاتێک ڕێ پێوان ،ئەو دەمەی کە ولات تاریک داهاتبوو ،لە بەرزایی بەرەو گوندەکاندا گەڕاین. لەکاتێکدا کە پێشەنگی لەشکر پێی دەنایە گوندەکان ، پاشەنگ تازە لە داویین. دەروازەی کوێستانوە دەر

دەکەوت. لەم وەختەدا بوو کە پۆلێکی بچووکی کوردەکان هێرشیان کردینە سەر ،ئەمە ڕوودا وێکی تالّ بوو وپێی سەلماندین کە ئەگەر کوردەکان دەستەیەکی گەورەتر پێکەوەنێن دەتوانن لایەکی لەشکرەکەمان ڕەش بکەنەوە.

هەرلە سەری شەوێوە لە دۆلێکا لەشکربەزمان کردو پەسیومان گرت ،هەر چەند کە شوێنێکی باش نەبوو ،چونکەلە بەرزاییەکانی دەوروبەرمان قەراولەکوردەکان چاویلان لێ زیت کرد بووینەوە و تروسکەی ئاگرەکەیان لەمەوە دیار بوو.

سبەینێ بەیانی ،ئێمەی سەرکردە کۆبووینەوە و دوای تەگبیر وراوێژلێ بڕاین کەهەرچی ئەوانەی سەربارن و بەکاری شەڕ نایەن بەجێیان هێلّین وباری خۆمان سووک بکەینەوە ،بۆئەوەی دەستوورەکە بەباشی بەڕێوە بچێ لە زارکی ڕێگەیەکی تەنگەبەر وێستاین ولەشکرمان گرتە ژێر چاوەدێری وبەمجۆرە ئەوی ئەسیر وشەل و کوێر وچوارەوای کز ولاواز بوو لەوی جێمان هێشت ورۆیشتین ئەوێ رۆژێ لەچەند جێگەوە

لەگەل دوژمن تێک ئالاین. بۆ سبەینێ را ڕەشەبای کوێستان هەلّیکردێ،بەلامچونکە توێشوومان لێ بڕابوو لەهیچ کوێ مەنزلّمان نەخست هێرش. وپەلاماری کوردەکانیش لەگەلّ تۆفانەکە دەستی پێ کرد.

---

۱) (٤٣٠ – ٣٥٥ی پێش زایین).

۲) سلسلەیەکی پادشانی ئێران بوون وسەرسلسلەکەیان کوروشی مەزن ودوایین پادشایان داریوشی سێهەم بووە لەسەدەی ٤ تا ٦ی پێش زایین لە سەرکاربوون وپایتەختیان پازارگاد بووە وبەدەستی ئەسکەندەری مەقدونی محف بوونەوە.

۳) (٤٨٤ – ٤٢٥ی پێش زایین)

۴) (سەدەی ٤ و ٥ی پێش زایین)

۱)

۲)

۳)

۴)

۵) مەبەست کوروشی (صغیر)ە کە برای ئەردەشیری دووهەم بووەونابێ لەگەلّ کوروشی مەزن کوڕی کامبیز (کبوجیە) بەهەلّە بگیرێ.

۶) ٣٧٩ – ٣٨٣ی پێش زایین.

گردوپەڕ : کەنار، (ساحل)

دەهۆ : فیلّ، (حقە).

بوار : تەنکایی نیسبێی لەوچەم و رووبارانە ،کەپیادە دەتوانێ پێیاندا بپەڕێتەوە ، (گدار)

کوندە : پێستی بزنە کەبە ساغی دەرهاتبێ و خۆشکرابێ بۆ ئاوتێ کردن ، (مشک).

لوان : گونجان وهەلّسووڕان(امکان)

۷) واوێدەچێ ئەم شاهەنشایە داریوشی دووهەم (اخس) بووبێ کە لە سالّی ٤٠٤ی پێش زایین کۆچی دوایی کردووە.

کابرایەکی گێلی ماڵ وێران هەبوو هەرچی پێیان دەگوت کاریٚ بکە ،دەیگوت جا بۆ لە خۆڕا خۆماندوو کەم؟ بەختی من لە مێژە نوستووە ئاخر هێندەیان پێ گوت جاڕز بوو هەتا وای لێهات رۆژێکی قەراری دانا وەدوو بەختی خۆی کەوێ و لەوێ وەخەبەری بێنێ .

زۆر رۆیی کەم رۆیی تووشی گورگێکی بوو .گورگە هەرای کرد :

ـ مامە ئەوە بۆکوێ دەچی ؟

کابرا کوتی :

ـ دەچم وەدووی بەختی خۆم دەکەوم .

گورگ کوتی :

دەباشە ئەگەر بەختت دیتەوە لێی پرسە بزانم بۆچی ئەمن هەرچی دەخۆم تێرناخۆم؟

کابرا کوتی :

ـ بەچاوان شەرت بێ ئی تۆشی پێ بلێم.

ئەوەندێ کوت ووەڕێ کەوت.دیسان کەم رۆیی زۆر رۆیی گەیشتە مەزرایەکی کابرایەک جووتی دەکرد لێی چۆپێشێ وکوتی :

ماندوو نەبی مامە!

جوابی داوە :

ـ بۆخۆت بەخێربێی،ئەوە بۆکوێ دەچی بەخێر؟

کابرا کوتی :

ـ وەڵڵا ئەوە دەچم وەدووی بەختی خۆم دەکەوم.

کابرای جووتێر کوتی :

ئەگەر بەختت دیتەوە لێی پرسە بۆچی ئەمن چەند ساڵە لە سەر ئەو پەڵە زەوییەی کارێ دەکەم بەڵام

قەتم هیچ نیە و زەوی یەکەم نان و تۆویش ناکا ؟

گێلە کوتی :

بە چاوان ئی تۆشی لێ دەپرسم . شەوێ میوانی کابرای بوو بەیانی هەمان هەمان هەستا وەڕێ کەوتەوە .

بە قەولی چوان کەم ڕۆیی زۆر ڕۆیی

گەیشتە شارێکی .

ڕەسمی ئەو شارەش وابوو هەرکەس چووبایە دەبا شەوێ میوانی پاشای بایە .

هەر کە کابرا لاقی دەشاری نا وەپێش خۆیان داو بردیانە خزمەت پاشای

پاشا کوتی :

کابرا بۆکوێ دەچی ؟

کابرا کوتی :

ـ پاشا سلامەت بێ بەختی من نوستووە دەچم وەخەبەری دێنم .

پاشا کوتی :

ئەگەر بەختت دیتەوە ، ئەمنیش پرسیارێکم هەیە ئەوەشی لێ پرسە

کابرا کوتی :

بە چاوان پێم بلێ ئەمنیش لێی دەپرسم .

پاشا کوتی :

ئەمن ئەوە مەملەکەتم لەبەر دەستی دایە ولێرە کەس لە من گەورەتر نیەکەچی قەت دڵم ناپشکوێ . بزانە لەبەر چی وایە .

کابرا ڕۆیی ، ڕۆیی هەتا بەختی خۆی دیتەوە . تەماشای کرد لە بن دارێکی خەوی لێکەوتووە . وەخەبەری هێنا

بەخت کوتی :

گێلە ئەوە ئەتۆی لە ترسی تۆ پەنام بۆئەوشاخ وداخە هێناوە .

لێرەشم لە کۆڵ نابێەوە . بڕۆئیدی تازە خەمێ مەخۆ رزگاریت هات .

کابرا کوتی :

بەختگیان لە ڕێیە تووشی گورگێکی هاتم ئەویش پرسیاری

هەبوون دەیکوت بە بەختی بلێ
ئەمن بۆچی هەرچی دەخۆم ،تێرنا خۆم؟
بەخت کوتی :
بە گورگی بلێ پیاوێکی کەر بخوا
تێردەخوا.
کابرا کوتی :
کابرا یەکیش زەوی دەکێلا .دەیکوت
زۆری سەعی لێ دەکەم بەلام قەت

بەروبووی زەوییەکەم بەشی وەختاو
وەختێم ناکا.
بەخت کوتی :
– ئەویش زەوییەکەی خەزینەیە-
کی تێدا ئەو خەزێنەیە دەرێنێ
زەوێ کەی چادەبێ .
کابرا کوتی :
پاشا یەکیش دەیکوت قەت دلم
ناپشکوێ چ بکەم ؟
بەخت کوتی :
ئەویش کچە بلێ مێردێ بکا چادەبێ.
کابرا مالێ ئاوایی خواست و وەرێ
کەوت .هات ،هات هەتا گەیشتە
شاری پاشای .لێی میوان بوووکوتی:
– بەخت دەیکوت پاشا کچە
مێردی بکا چاک دەبێ ودلێ دەپشکوێ
پاشا کوتی :
جائەگەر وایە تاکەس نەیزانیوە
وەرە مارەم کەوببە بە پاشای ئەو
مەملەکەتە .
کابرا کوتی :
برۆ دایکم برۆ ئەمن تازە بەختم
وەخەبەر هاتووە ژنم بۆچیە؟ ئاخر
هەرچەندی پاشا لە بەری پاڕاوە

بە قسەی نەکرد ورۆیی
کەم رۆیی زۆر رۆیی هەتا گەیشتە
کابرای جووتێر کوتی :
بەخت دەیکوت :
خەزێنەیەکی زێڕوگەواهیرات لە
زەوێ کەی دایە ئەوی دەرێنێ
زەوییەکەی بەکەیفی وی وەبەرەکە-
ت دەکەوێ .

جووتێر کوتی :
جا هەتا کەس نەیزانیوە هەستە
برۆین بیدەینەوە وخەزێنە دەرێنین،
نیوەی تۆو نیوەی من بەشی دەکەین
کابرا کوتی :
مامە خەرفاوی ؟ ئەمن تازە بەختم
وەخەبەر هاتووە کوا موحتاجی

ئەو جوورە شتانەم .
ئەویش زۆری لەبەر پاڕاوە بەڵام
نەیسەلماند و ڕۆیی.
گەیشتەوە گورگی .گورگ کوتی :
بەختت دی ؟
کابرا کوتی :
ـ بەڵێ ئەرێ وەڵڵا دیتم.دە ـ

یکوت بە گورگی بلێ پیاوێکی کەر و
گێل بخوا تێردەخوا.
گورگە کوتی :
دابۆم بگێڕەوەبزانم چۆن چووی و
چۆن هاتیەوە وچت دی؟
سەرت نەیەشێنم چۆنی بۆ ئێوەم
گێڕاوە کابراش ئاوای بۆ گورگە

گێڕاوە .
گورگ ئامبازی بوو. کوتی :
ئەگەر وابێ لە تۆم کەرتر وەگیر
ناکەوێ .
گرتی خواردی وئاسوودە ورەحەت .
ئەمنیش هاتمەوە لەولاڕا کاڵەم
دڕاوچم پێ نەبڕا .

هەرکەس بێتوو شیعرێکی
نالی لەبەرچاوی خۆ ڕۆنی و
بەلای خۆیەوە لێکی داتەوە و
هەلیسەنگێنێ جا ئەوجا ربچێتە
سەر شی کردنەوەی ماموستایانی
موحەقیق بۆی دەردەکەوێ کە
ئەوبەڕێزانە چەندەیان لە
گەڵ ئەو دیوانە زەحمەت
کێشاوە وچ کارێکی گەورە و
گرانیان کردووە. ئەوکاتە بە
دڵ سوپاسیان دەکا ودوعای
بەخێریان بۆدەکا .

لەگەڵ ئەوەدا کە ساغ
کردنەوە و ڕێک وپێک کردن و
شی کردنەوەی ئەو دیوانە
لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردی
دا بێوێنەیە، بەڵام بێ کەم و
کوڕیش نیە .

ئەو کەم و کووڕیانە کە
لەچاو ئەوکارە یەکجار بچووکن
دەتوانێ لەو بارانەوە بێ:

١ - پێ ناسی شیعرەکان
٢ - زێدەکردن یان
قرتاندنی بەستەشیعرێک
٣ - پاش وپێش کردنی بەیت
گەلی شیعرێک
٤ - بۆچوون ومانالێ
دانەوەی شیعرەکان
٥ - چۆنیەتی چاپ بوون
کەلەوانەیە تەواوە ومانای
شیعرێکی تێک دابێ (ئەگەر
جوانی کردبێ چ باشتر ) .

شک لەوەدانیە کەنووسین و
باس کردن لەسەر تەواوی ئەو
بابەتانە بەشێوەی دروست
خزمەتێکی گەورە بەئەدەبی
کوردی و ئەدەب دۆستانە، جا
هەرکەسە لەبارستایی هێز و
لێزانی خۆی، بۆوێنە باس
کردن لەسەر بابەتی یەکەم
"نالی" ناسی باشی دەوێ ولە
تاقەتی هەموو کەس دانیە .

بەوهیوایەلەسایەی نووسینی
دلسۆزەکانەوە بەتایبەتی ئەو
ماموستایانەی چاوەروانیان
لێ دەکری، ئەم گۆوارە
خوشەویستە هەموو جارێ چەند
لاپەڕەیەکی خۆی بۆ ئەم باسانە
تەرخان بدا، ئەوا لێرە
لەسەر ماناو واتای دووبەیتی
یەکێک لە غەزەلە هەرە
جوانەکانی "نالی" دەدوێین
کە بەم جۆرە دەست پێ دەکا
( ل ٧٩ )
دەگاتە ئەو بەیتە .

**ڕەنگی نیە روخساردی**
**ڕەنگین ولەتیفی**
**ڕۆشن بووە ئەم نوکتە سەباتی**
**لەبەسەر دا!**

کەلە دیوانەکەدا ئاواشی
کراوەتەوە: ( ل ٨٠ )
" واتە : ڕوومەتی جوان و
ڕەنگینی لەبەرناسکی وشەفافی
ڕەنگی نیە و چاو نایبینێ و
ئەم شتە لای کەسانی بینا و
وریا سەلمێنراوە وجێ گیر
بووە چونکە چاو ناتوانێ شتی
بێ ڕەنگ ببینێ "

لەپێشدا دەبێ ئەوە بزانین
کە ماکە وهۆی دیتن، بەرلە
بوونی ڕەنگ، نوورە .

**ئەستێرە هەموو مەحوە لەنێو**
**نووری قەمەر دا**
**یا شەمسی جەماڵت شەوی گێڕاوە**
**بە فەڕ دا ؟**

لەشی کردنەوەی ئەم غەزەلەدا
کەم وکووڕی نابیندرێ تاکوو
هەرشتێک کە بۆ خۆی
نوورانی نەبێ، یان نوورێکی
وێ نەکەوێ و ئەو نووورە
هەڵنەگەڕێنێتەوە بۆچاو،
نابیندرێ، بێتو نەش بیندرێ
ناتوانێ ڕەنگی هەبێ. ئەگەر

بڕوامان بەوەهەبێ ،دەبینین
کە ئەو بەیتە لەگەڵ بەیتی
یەکەم و باقی غەزەلەکە
جیاوازی هەیە وەکی لەبەیتی
یەکەمدوە دەردەکەوێ شاعیر
نەتەنیا جەماڵی یاری دیتووە
بەڵکوو ئەوتۆشی دیوە کە
شەوی لێ کردووە بەرۆژ.

کەوابوو مادام کەدیتوویە-
تی یارناتوانێ بێ رەنگ بێ .

بەڵگەی تریش بۆ ئەوە کە
یار دیتراوە وبێ رەنگیش نیە
ئەوەیە کە شاعیر خۆی دەڵێ:
روخسارەیی رەنگین "

ئێستا بۆ ئەوە کەمەسەلەکە
روون بێتەوە پەنا دەبەین بۆ
فەرهەنگی زمانی فارسی
بزانین "رەنگ" بەمانای
چیە ؟ .

بۆنموونە دەبینین کە لە
فەرهەنگی "معین" و"عمید" دا
رەنگ بەمانای عەیب وعار و
ئیرادیش هاتووە .

بەوپێیە مانای ئەربەیتە
ئاوای لێ دێ :

**روخسار ورووومەتی رەنگین و
ناسکی یاربەبێ عەیب و
ئیرادە .**

**ئەم نوکتەش لە چاو وبینایی
مندا سەلمێندراوە.**

هەرکەس بروا ناکا ،بێ و
بەچاوی من لەیار بروانێ .*

ئێستاکە لەسەر ئەوە
ساغ بووینەوە دەچینە سەر
بەیتێکی تری ئەم غەزەلە کە
دەڵێ :

**شەوقی کەنەبێ باسیرە
مەئیووسە لە دتین
هەر شەوقی ئەوە قووەتی دینی
بەنەزەردا**

( ل٨١)

مامۆستایانی بەڕێز بە دوو
واتا ئەو بەیتەیان شی-
کردۆتەوە

ئەگەر هەست وخەیاڵی
شاعیرمان لە تەواوی غەزەلە-
کەدا لە بیربێ وچاوێک بەو
دوو واتایەدا بگێڕین
دەبینین کە واتای یەکەم زۆر
بێهێزە ، چونکە ناتوانین
وەکوو ئەسڵێک بڵێین :

**"چاوئەگەر شەوق وئیشتیاقی
نەبێ نابینێ وا!! "**

(ل ٨١ )

**واتای دووهەم بەهێزترە
وراستیشە ، هەرچەند
بەپارێزەوەبۆی چوون :"
ڕوومەتی یار کەوەک هەتاوە
بۆتە هۆی بینین " ئەگینا
چاو لەتاریکیدا نابینێ .**

( ل ٨٢ )

بەپێی نووسین و چاپ بوونی
ئەو بەیتە مامۆستایان
ناحەقیان نیە ، کە
ئەمەیان وەکوو واتای دووهەم
و بەپارێزەوەهێناوەتەوە ،
ئێستا بۆ ئەوە کەدڵنیابین
ئەو واتایە راستە ، بە
دەست تێوەردانێکی کەمەوەئەو
بەیتە ئاوا دەنووسین :

**شەوقی کەنەبێ ،باسیرە
مەئیووسە لە دتین
هەرشەوقی ئەوە قووەتی دینی
بەنەزەر دا**

واتە : ئەگەر نوور و
شەوقێک نەبێ ، چاوناتوانی
شتێک ببینێ ، منیش کە
بەوشەوە توانیومە یاربببینم
هەر لە سۆنگەی روونکی ئەوە
وەتاوی روخساری یارهێزی
دیتنی بە چاوم داوە .(شەوقی
: شەوقێک ، نوورێک )

- بەلای ئێمەوە واژەی
"رەنگی" لە " رەنگ"و " ی "
ی نیسبەت پێک هاتووە ،مانای
شیعرەکەش ئەوەیە :

" روخساری رەنگین و
لەتیفی ئازیز بەهۆی رەنگەوە
جوان نەبووە . رەنگینیەکەی
سروشتی یە و پێوەندی و
نیسبەتی بە رەنگ (سوراو و
سپیاوە )وە نیە وکەسێک بە
سیرەتی بێ وباش بڕوانێ ئەم
راستی یە دەسەلمێنێ .

**(سروە)**

نەزەرت لەبارەی ژن بەژنەدا چیە؟

ماموستا مەلارەسووڵ ......

ژن بەژنە لە نەزەر شەرعەوە حەرامە، بە هیچ جۆر ئیمکانی نیە، زەرەری ژن بە ژنە لە ئیسلامدا ئەوەندە زۆرە کە لە نووسین وگوتن نایە. قەت نەدیتراوە چواردڵ یەک بگرن ورێک بکەون وبتوانن بنکەیەکی پڕلەئەوین و خۆشەویستی پێک بێنن.

ماموستا رەبیعی ......

ژن بەژنە مەسەلەیە کە لە فیقهی ئیسلامیدا

بەکار دێنن تا خەڵک خۆ لەم کارە بپارێزێ.

ماموستا ئەمین ......

ژن بەژنە بۆخۆی مەسەلەیەکی جوێ نیە، بەڵکوو شاخ وبەرگێکە، گەڵایەکە لە دارێک. لە مەسەلەی ژن هێنان و ئیزدواجدا لەنێو کورد ئیشکال یەکجار زۆرە. لە ژن بەژنەدا کە بە بڕوای من زوو بەمێرددانی کچانە لەدووبارەوە دەبێ بخرێتە بەرباس.

یەکەم لەباری کۆمەڵایەتیەوە

دووهەم لەباری شەخسیەوە

بەڵام بەگشتی دەردێکی گرانی کوردە شتێکی

کەریمی قەییوومی

# ...ژن بەژنە؟

باس کراوە، بەڵام زۆر ناپەسەندومەزموومە لە وڵاتی ئێمەدا نیە، ئەو ژن بە ژنە کە زۆر ناپەسەندە لەنەزەری شەرعەوە، ئەوەیە کە دوو ژن لە دوو پیاو مارە کراون، مارەیی هەر کامیان بریتیە لە حەڵاڵ بوونی نامووسی ئەو ژن وپیاوە، یانی مارەییان بۆ دیاری ناکرێ. مارەییان بریتیە لە حەڵاڵ بوونی هەرکام لەم ژنانە بۆ ئەو پیاوەکەیتر. تەنانەت لە نەزەری شەرعدا بەناوی شەغار ناوی دەبەن. شەغار لەفزێکی زۆر قەبیحە بەمانای لاق هەڵبڕینی سەگ. هەربۆیەش ئەم لەفزەی بنۆ

تایبەتی نیە، دروست کراوی کەسێک نیە، دروست ـ کراوی دۆست ودوژمن نیە بەڵکوودیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە، وەختێک ئێمە ئیعتراف دەکەین کە ئەم نەنگە هەیە دەتوانین چارەی بکەین. یانی دەبێ هەمیشە پێ لە تاوان وگوناهی خۆمان بنێین تا دوژمن بۆمان بەرزنەکاتەوە.

ژن لە جامیعەی ئێمەدا ئەبزارێکە بۆ معامەلە وەکوو شتێک کە (وجە المصالحە) بێ دەگوردرێتەوە. بۆئەوەی کەسێک بنەماڵەیەک رازی بکا کە ژنێکی پێ بدەن لە بەرابەردا وەکوو کالایەک کچێک دەدا بەو بنەماڵە.

ئومێدەوارم ئەم نەنگە بتوانین بشوێنەوە.

شەوکەت ....

...بابم خەڵاتی کردم.ڕۆژێکی بابم هاتەوە میوانێکی دەگەڵ بوو،هاتنەوە.ئەو میوانە کابرایەکی تووڕەوتۆسن و بەدفەڕ بوو، بابم قاچاقچی بوو ئەویش تووتنی بۆ ڕاپەڕاندبوو نەیهێشتبوو بگیرێ.ئەویش بەتۆڵەی ئەو پیاوەتیەیە ئەمنی خەڵات کرد.پاش ساڵ و نیوێکی گیرا و ئێستاش ئەوە لەسەر تریاکی گیراوە و لەوانەیە بیکووژن.ئەمنیش ئەوە سەرگەردان و دەستە شکاوم.

**کاک موحسینی سیددیقی**

بەلای منەوە ژن بەژنە ریشەیەکی کۆن و لەمێژینەی هەیە،ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەروبەندەی کە کورد شارنشین نەبووە، ئەو دەم کابرایەک پێنج کوڕی بووە تەبعەن داهاتیشی پتر بووە.ئەو لەبەر خاتری ئەوەکە کارکەرێکی لەماڵ دەچێتە دەر یەکی‌تر جێگەی بگرێتەوە وەژن بەژنەی کردووە یاخۆ بنەماڵە ـ یەکی هەژار ودەست‌کورت‌تەنیا توانیویەتی بەدانی خوشکی خۆی بە کابرایەکی‌تر ژن بخوازێ.

من پێم‌وایە یەکێک لە بەڵا گەورەکانی کۆمەڵی کوردەواریە و دەبێ هەموو دەست بدەینەدەست یەک،بۆ لەنێو بردنی ئەم ئافەتە هەول بدەین.واباشە بەناوی جینایەت ناوی بەرین ئەویش لە سەدەی بیستەمدا.

خاڵ هەمزە......

چ خودا بەردارە ئەمن پووڵێکی بدەم ژن بخوازم پووڵێکیش بدەم کچ بە مێرد بدەم. ناوەڵڵا ژن بە ژنەی دەکەم.هەم کچەکەم بەمێرد دەدەم هەم ژنێ بۆ کوڕەکەم دێنم هەم ئەو پووڵەی لەو ڕێیەدا خەرجی دەکەم بۆ ماڵ و منداڵی خۆمی خەرج دەکەم.

**کاک عەلی خـزری .....**

ئەو باوە ناحەزە ئێستا هەیە.دەبێ دان بەوە دابێنین ڕاستەقینەیەکی تاڵ ونالەبارە ۆ مادام کە هەیە دەبێ باسی لێبکرێ.بەڵام ئەگەر نەزانین چۆنی باس بکەین کارمان وەک کاری ئەو کەسەی لێدێ کە باسی زیانی سیغار ـ کێشان لەلای سیغارکێشێک بکا.ئەوسیغارکێشە ئەمەی تۆ لێی دەترسێنی ئەو بە لەش وخوێن و دەمار و پێستەوە هەستی پێ دەکا و لە تۆی باشتر دەناسێ،واباشە بگەڕێیەوە سەر ڕەگ و ریشە وهۆی ئەو باوودابە ناحەز ونالەبارە، لە بارێکی دیکەوە بۆی بچی و مەودای تێفکرین و بیرکردنەوەی بدەیەی.

خەدیجە .....

...ڕەدوو کەوتم.چون ئەوەی دەبوو مێردی پێ بکەم عاقڵی سووک بوو،بابیشم‌بە زەبری دەمانچەی مارەی کردم.ئەمنیش بە مارە و تەڵاقەوە هەڵاتم.ڕەدوو کەوتم.ئەوە سێ ساڵە مەسڵەتم کراوە ئەمما باوە خوێن نەکراومەوە.

## ● ئیسلام چ حەققێکی بۆ ژن دیاری کردووە؟ ●

**ماموستا مەلارەسووڵ ....**

لەنیزامی ئیسلامیدا ژن بایەخ‌وئیحترامێکی تایبەتی هەیە کە بەداخەوە ئێستا لە دەستی داوە.تەنانەت مافی ژیانیشیان لێستاندووە. ژن مافێکی هەیە،خودای(جل جلاله)ژنی بە عینوانی ئەمانەتێک داوە بە پیاو کە دەبێ ئەم ئەمانەتە بپارێزێ.ئەویش ئەو هەقەی‌هەیە کە ئێمە هەمانە و دەبێ بمانبێ.

کاک برایم....

...کێهە...بەخودای کچ بلێ لەل چاوی بە پشتەسەریدا دەردێنم.ئەمن ئەو حاڵ وحیسابەی نازانم.

**کاک موحسینی سیددیقی......**

بەداخەوە ژن لە سەرەتاییترین مافی‌ژیان بێبەشە،ئاخر ئێوە بڕوانن ژن بەتایبەتی لە دێهاتدا تەواوی شەووڕۆژی دابەش‌کراوە بەم شێوە:

حەیوان دۆشین،مەشکەژاندن،جلک دروون هەوێن کردن،نان کردن ،دەوەکردن،ڕیخ‌ڕشتن ،

شیووکوڵ،تەون، پاش نوێژانیش لە دەشت وکێو سووتەمەنی کۆ دەکاتەوە ،منداڵداری،بەکورتی ٥٠ ـ تا ٧٠ لە سەدی ئابووری ماڵ بەدەست ژنەوەیە ، بەڵام دە لە سەدی مافی خۆی نادرێتێ

کوێخا عەولا....

کورە بابم ئەو قسانە چن،کچ و کوڕ چ هەقیان هەیە بڵێن نا ! جا ئەگەر وایە من مردووم منداڵ لەپێشم راوەستێ و بڵێ نا .

ماموستا رەبیعی......

پێغەمبەری مەزن درووودوسڵاوی خوای لێ بێ فەرموویەتی :

ئەگەر کەسێک هات وداوای ژنی لێ کردن ئەگەر لە دینی رازی بوون واتە موسڵمان بوو لە ئەخلاقی رازی بوون واتە بە فەسادی ئەخلاقی مەشهوور نەبوو خزمایەتی لەگەڵ بکەن ئەگەر ئەو کارە نەکەن فیتنەوفەسادێکی زۆر لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوە و ئەو دەم ئێوە مەسئولن ،بەڵام کاتێک ئەو قانوونە بەخراپ بچێتە گوێ شێوەی کچ فرۆشتن پەیدا دەکا . داوای دووسەت هەزاری نەغدوسەدهەزار زێڕ و ماشێن وشوغل وکاروسەفاریشاتێکی کە لە کارخانەی خیلقەتیشدا دەست نادا بوئەوکەسە کە ژن دەخوازێ ،ئەوەندە خاڵ وخانباجی خۆ تێهەڵدەقوتێنن وبێجێ هەڵدەدەنێ کە ئیختیار لە دەس ئەو ژن ومێردە دەچێتە دەر و ئەو کەسە ناتوانێ ژن بێنێ،کچێک ناتوانێ مێرد بکا سەرەنجام دەبێتە هۆی ئەوە کە کارەکە ببێ بە معامەلە و سەودا و ببێتە ئەو ژن بە ژنەی کە ئێستا دەیبینن .

قادر.....

چ باش و چ خراپ تازە پێوە بووم.بابم هەموو منداڵەکانی بەقوربانی خوری مەڕکەی کرد...

ریشەی ئەم مەسەلە لە چیدا دەبینن؟

ماموستا مەلارەسووڵ ......

ئەو مەسەلە دەگەرێتەوە سەرباسی

وەلی موجبیر .لە شەرعی خۆماندا ئەو باسە یانی باب یا وەلی دەتوانێ بە لەبەر چاو گرتنی ژیانی داهاتووی کچەکەی خۆی،بەمێردی بدا ،بەڵام وەلی موجبیر شەرایەتی هەیە ،کە بە بڕوای من لە جامیعەی ئێستای ئێمەدا زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ،ئەویش تەنیا بۆ کچە ، یانی هیچکەس حەقی بەسەر بێوەژنەوە نیە ، سەرەڕای ئەوە ئەم باسە بۆ هەل و مەرجێکی زەمانی و مەکانی تایبەتییە و لە هەموو جێگایەک بەکار نایە .

خوشکەفاتم...

ئێستاش ئەوە دووساڵە تەڵاق دراوم ئەمما دوو منداڵەکانم(دەست دەکا بەگریان ) دایکتان کوێر بێ داخودا چ دەکەن؟

.... بەڵێ تەڵاق بە تەڵاقم پێ کراوە... باربەهاکەی من دانەنیشت .ئەمنیشیان تەڵاق دا .

ماموستا ئەمین .......

ریشەی ئەو کارە دەبێ لەوەدا بدۆزینەوە کە بایەخ بۆ ژن دانانرێ و ژن بەناوی ئەبزارێکی کار لە جامیعەدا ناو دەبردرێ، هەڵبەت مەسەلەی ئابووری بەتایبەت لەم بارەوە کە لە پێشوودا گوتم دەورێکی بەر چاوی هەیە .

لە لایەکی دیکەوە ئەو باسانە وەک زنجیر بە یەک وەسڵن ، چلۆنایەتی ژیان و داب و

رەسم و باوی کۆمەڵایەتی لە کوردەواریدا دەبێ بە جوانی بناسرێ، جا ئەوەدەم کە دەردمان ناسی و دانمان بەوە داهێنا کەدەرد هەیە ئەمجار لە حەولی دەرمان دادەبین .

خوشکە مریەم.....
لەخوادام تەڵەبە بابم لەدار بدەن و من لینگە فرتەکەی بەچاوی خۆم ببینم.

## ● ڕێگا چارە چیە؟ ●

ماموستا رەبیعی ......

ڕێگا چارە زۆرە ،ڕێگا چارەی دەست بەجێ ئەوەیە کە وەک قورسی موسەکین وایە واتە ماموستاکان،ماموستایانی ئایین بە خەڵک بفامێنن لەبەرنامەی رادیۆییدا ،یا لە بەرنامەی وەعزی مزگەوت و جومعەوجەماعەتدا مەفاسیدی ئەو کارانەیان پێ حاڵی بکەن و ڕێنموونیان بکەن و دەست لەم باسە هەڵنەگرن. نەجارێک ، نە دووجار ، نە دە جار ، قسە ئەسەر دەکا لە مەغزی ئینساندا .

بەرنامەی درێژخایەن ئەوەیە کە خەڵک بخوێنن رادەی فەرهەنگیان بچێتە سەر ، تا ئەو جێگەیە خێر و شەڕی خۆیان بزانن،خۆیان ببنە ماموستای خۆیان.

بڕواننە پەروەندەی دادگاکان،زوربەیان سەختگیری ئەشخاسە سەبارەت بە جەوانەکان ، بە کوڕیان، بە کچیان، چون زوربەی جینایەتەکان لەباری غەریزیەوە دەبێ بەرڕەسی بکرێن .

پوور ئەسنی.....
دایکەکەت کوێر بێ گەوەر ،بەخودای هەرمێ تەکێنێکیان تێدا شکاند هەتا ملی دا.

ماموستا ئەمین .....

دەبێ بیری کۆمەڵ بێدار بکەینەوە بەرەو گەورەیی ئەم دەردەلێرەدا عەقیدەم وایە کە هەم دەبێ موتەوەسیل ببین بە شتێکی زۆر ، قودرەتێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و هەم لە لایەکی دیکەشەوە سەرنجێکی پتر بدەینە ناوچەی دێهاتی کوردستان .

هەم خەڵک و هەم دەوڵەت دەبێ بەرگری بکەن لەکاری هیندێک لە ماموستایانی ئایینی کە ئەم کارە دەکەن !

زارا.....
... ئەرێ وەڵڵا کوت کوتم بکەن هەر کوتەی بەرنە مەملەکەتێکی ئێستا ناچمەوە.....

ماموستا مەلا رەسوول ....

ژن بە ژنە لە جیهانی ئیسلامیدا هەڵەیە ، دەبێ بە گشتی بنەبڕ بکرێ،لە لایەکەوە دەبێ تەبسەرەیەک لە قانووندا سەبارەت بەو مەسەلە ببێ و بە هەموو سەردەفتەر و ئیمام جومعەکان رابگەیەندرێ ئەوەدەم خەڵک ناتوانن ئەو کارە بکەن یانی خەڵک ئیتاعەی ڕێبەری ئایینی خۆیان دەکەن .

چاو لێ بکەن کەسێک کە سەبارەت بە کچی مەحرەمی خۆی، کچێک کە خودا بە عینوانی ئەمانەت پێی سپاردووە و دەبێ ڕێزی لێ بگرێ خەیانەتی پێ بکا ، گەورەترین تاوانە . نابێ بۆ خاتری ئەوە کە ژن بۆ کوڕی دێنێ کچەکەی چارەڕەش بکا ،بە بڕوای من ئەوانە لە ڕێزەی گەورەترین جنایەتکارانن .

جا کەوابوو لە تەواوی ماموستایانی بەڕێزی ناوچە داوا دەکەم کە کچی نابالغ و سەغیر مارە نەکەن.

داوا لە باوکەکان یا (وەلی موجبیر) دەکەم کە لە ئەمری کچ بە شوودانیدا هیندێک وردتر بیر بکەنەوە ،جارێ نابێ دەخالەت بکەن لە بە شوودانی(شبیە ) یا بێوەژن،چون ئەو دەستەڵاتی خۆی لەبەر دەستی خۆی دایە .

لە برایانی بەڕێز و خۆشەویستی کورد داوا دەکەم وەختێکی کچەکەیان گەیشتە ئەو سەروبەندە کە مێرد بکا ، لە هەڵبژاردنی هاوسەر تەرخانی بکەن و ئەو ئیزنەی بدەنێ کە بۆخۆی ڕێگەی داهاتووی خۆی هەڵبژێرێ.

حاجی عەلی ....
من ئەگەر پوولم هەبا ژن بە ژنەم نەدەکرد بەڵام رووی بێپوولی رەش بێ .

درێژەی هەیە

# ئێمـــ سروه ـــە و

بانە: **کاک ع.مەولوودی**

لەزمانی کوردیدا وشەیەکی رەسەنمان بۆ "مجلە" وفۆلکلۆر" نیە ،بەڵام گۆوارلە جێگای "مجلە "بەکار دەهێنرێ وبۆ فۆلکلۆریش کە بەمانای فەرهەنگی گەل "ە تائێستا وشەیەک دانەتاشراوە . ژن هەڵگرتن یەکێک لەودابە ناپەسەندەکۆمەڵایەتی یانەیەکە دەبێ بەربەرەکانی لەگەڵ بکرێ وهیوادارین لەو شوێنانەش کەپتر باون شوێنەواری نەمێنێ ..هەڵبەت ئەوە مەبەستێکی روون و ئاشکرایە کە هەردەردێک دەبێ لە ریشەوە دەرمان بکرێ وهۆیەکانی لەنێو بچێ . بەهیوای خوالەژمارەکانی "سروە"دا هەربەم زوانە بەوردی لەسەری دەدوێین .

تاران : **کاک محەممەدی مستەوفی**

پێشنیارەکەتمان بەدڵ نەبوو ، چونکوو ئێمە دەمانەوێ بۆ پێک هێنانی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی هەوڵ بدەین شیعر و فۆلکلۆری هەرناوچەیەک بە لەهجەی خۆی بڵاودەکەینەوە، بەڵام پەخشان وبابەتەکانی دیکە دەبێ بەزمانی یەکگرتووبێ دەستەی نووسەرانی سروە دەتوانێ بەبێ دەست تێوەردان لەنێوەرۆکی نووسراوەکان لەباری زمانەوە دەستکاری یان بکا .

بانە : **کاک فارووقی قادر خانزادە**

پێش ئەوەی شیعرەکانت ببینین ناتوانین بریاری لەسەربدەین هەربابەتەشیعرێکی وا کەهەستی شاعیرانەی تێدا بێ و قەواعیدی شیعری تێدا رەچاوکرابێ ونێوەرۆکەکەی لەباری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی یەوە بەکەلک بێ لەچاپ دەدرێ

باختەران : **خوشکەمەرزییە .ر**

بەداخەوە فەرهەنگ (قاموس) کوردی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نیە تابۆتان بنێرین .

گوندی نژویی بانە: **کاک ساڵح خونچەیی**

ئەگەر کوردە ئاوارەکان حیساب بکەی کەم وڵاتی دنیا هەیە کوردی لێ نەبێ .رەنگ. بێ کوردی پەریوە گەیشتبنە ئوسترالیاش ئەڵبەت جگە لەئێران وعێراق وتورکیا وسووریا، کورد لەشوورەویش نیشتەجێن بەڵام ژمارەیان کەمترە .

سمنان : **کاک موحسینی فەقێ شێخی**

دیوانی وەفایی چاپی ئوفسێتەونەمانهێناوەتە سەر رێنووسی خۆمان .هەرشتێکتان لەسەر نووسراوەکانی سروە نووسیوە بۆمانی بنێرە ، کەلکیان لێوەردەگرین .

گوندی رەحیم خانی بۆکان: **کاک ئەمجەدی سۆرانی**

هەر شیعرێک باش وبەکەلک بێ بەتایبەتی ئی شاعیرانیلاو بڵاوی دەکەینەوە .هەستی شاعیرانەی شاعیر بوئێمە گرینگەو هیچیتر .ئەگەر چیرۆکە کەشمان بۆبنێری دوای سەرنج دان وەڵامت دەدەینەوە

کۆسەکەرێزی مەهاباد: **کاک مستەفا ساڵحی**

بڵاوکردنەوەی پەندەکان بۆ زیندووکردنەوەیان پێویستە . نووسەروشاعیران دەتوانن لە شیعرونووسینی خۆیاندا کەلکیان لێ وەربگرن .

ئەگەر بمانەوێ بۆ هەر پەندێک نووسراوە یا میسالێک ببینینەوە بڵاوکردنەوەی شتی وانیازی بەکتێبی سەر بەخۆ هەیە و بۆ گۆوارێکی ئەدەبی ـ فەرهەنگی نابێ

تاران :**کاک رێبین ئەحمەد**

وێرای سپاس چاوەروانی گەیشتنی نووسراوە فەلسەفی و ئابووری یەکانی ئێوەین .

سەردەشت : **کاک محەممەدی خزری**

ئێوە دەتوانن گۆواری "سروە"

لەنوێنەری "اطلاعات" یاکتێب فرۆشی "معارف" لەشاری سەردەشت وەدەست بێنن .

سەقز: **کاک سەیدمحی الدین حوسێنی**

براگیان هیوادارین بتوانین ماوەی دەرچوونی گۆواری سروە کەم بکەینەوە .

بۆکان : **کاک فەرهادی شەریف نیژاد**

هەروەک زۆرجار رامان گەیاندووە هەوەڵ مەرجی فێر بوونی زمانی کوردی موتالای کتێب ونووسراوە کوردییەکانە هیوادارین "سروە"ش بتوانێ لەم رێگەدا یاریدەتان بدا

سەقز: **کاک کاوەی سوڵتان پەنا :**

نووسیوتانە "ئەسپی پێشکەشی تەماشای "ددانی ناکەن "ئەم مەسەلە راستە بەڵام ئێوەنابێ بەم چاوە تەماشای سروە بکەن بەڵکوو دەبێ ورد بیخوێننەوە رەخنەی لێبگرن ولەکەم وکوورییەکان ئاگادارمان بکەنەوە .

سنە : **کاک سمایلی محەممەدی**

پێشنیارەکەت یەکجار جوان وبەکەلکە .تۆ کەرشتەی کشت وکاڵ دەخوێنی وشارەزاییت لەم باتەشەوە زۆرە داوات لێدەکەین لەم چەشنە و تارانەمان بۆبنووسە تا بڵاوی بکەینەوە

نامەودیاری ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە .پڕ بەدڵ سپاسیان دەکەین وهیوادارین لەداهاتوو شداهاوکارو یارمەتیدەری گۆواری سروە بن .

گوندی نێوگی مەرگەوەڕ : **کاک خالید** -بۆکان : **کاک جەلالی عەشایری** - مەهاباد **کاک عبدالرحمانی شەنگە** - گوندی سەرچنار: **کاک سولەیمان بێ بەش** -گوندی کۆسەکەرێزی مەهاباد: **کاک محەممەدنازمی حیکمەت** گوندی حەڵبێی شنۆ : **کاک عوسمانی ئەحمەدی** کەرەج: **کاک ئەنوەر** - گوندی رەحیم خانی بۆکان : **کاک ئەمجەدی حاجی ئیسماعیل زادە** -بۆکان **کاک ئیبراهیمی ئەفخەمی** - ورمێ : **کاک س .هاوار .ئاشۆری** بۆکان : **کاک ئەمیری حوسێنی** پیرانشار: **کاک عومەرپالیش** نەغەدە : **کاک سەیدجەمالی شوکری** پیرانشار: **کاک ئاواتی ئەفزاری** -مەهاباد :: **کاک رەحمانی باپیری** -کەرەج **کاک شەماڵ جودایی** -بۆکان **کاک سیروان** -بۆکان : **کاک کەمالی ئەحمەدی** - تاران: **کاک سالحی عەتتاری** -کەرەج: **کاک بۆتان کۆیی** - بۆکان: **کاک عەلی خوسرەوی** -بانە: **کاک ئەمیری محەممەدی** - شنۆ: **کاک ئیبراهیمی لەعلیسانی** - بۆکان : **کاک سەلیمی سالحزادە** سەقز: **کاک محەممەدی ابو المحمدی** - پیرانشار: **کاک سیامەندی لەیلان** - سەقز: **کاک سیدمحیالدینقادری** - بۆکان : **کاک صلاحالدینی عەزیزی** - تەورێز : **کاک سەعیدی محەممەدزادە** بۆکان : **کاک الف م - .......** :**کاک محەممەدی شامرادی** -مەریوان: **کاک عوسمانی سادقی** - سەردەشت: **کاک رەشیدی ئازەربار** دیوالانی سەردەشت: **کاک حوسێنی شەخسە پوور** هەنگەوێی پیرانشار: **کاک صلاح الدینی حەسەن پوور**- قوروە :**کاک عەبدوڵلای یار عەلی** سەقز: **کاک عەلی ئاغا برا** - پیرانشار: **خوشکە خەدیجەی میهتەرنیژاد**-نەغەدە **کاک سەباح ئەویندار**-مەهاباد **کاک عەلی کەریم قەڵاتیانی** نەغەدە :**کاک عەبدوڵلای فەتتاحی** -سەردەشت: **کاک سولەیمانی عەبدی** -خۆی **کاک خدری .م** شیراز: **کاک جەوهەر قادر** -

## گۆرانی موکریان

له ناوچه‌ی موکریان

له‌باری زمان و زاراوه‌وه تووشی چه‌ند لایی و زاراوه گه‌لی جۆربه‌جۆر و لێک دوور نابین، له سه‌رانسه‌ری ئه‌م هه‌رێمه‌ی که به موکریانی داده‌نێن هه‌ر له لێره‌واره‌کانی ئالانی سه‌ر- ده‌شته‌وه به‌ره‌و چیا و کێوه‌کانی بنه‌وشه و گه‌ورکی سه‌قز هه‌تا تێکه‌لاوی خاکی تیکابی هه‌وشار ده‌بێته‌وه له‌وێوه به‌ره‌و ساین قه‌لا و پێده‌شته‌کانی سه‌ر به بناوومه‌لیکه‌ندی به‌شی مه‌راغه و باده‌داته‌وه به‌ره‌وشامات و شارویران،هه‌تا لێواره‌کانی زریای ورمێ ، له‌وێشه‌وه تێکه‌ل هه‌رێمی دۆل ده‌بێ و به شنۆیه‌دا به‌سه‌ر لێواره‌ی چیاکانی سه‌رسنووری دوو ولاتی کوردستاندا له مه‌لبه‌ندی پیرانشار و پیرانان تێده‌په‌ڕێ و به‌ره‌و سه‌رده‌شت تێ هه‌لده‌بێته‌وه . له ته‌واوی ئه‌م ناوچه‌یه‌دا که به گشتی شاره‌کانی سه‌رده‌شت ـ بۆکان ـ ساین قه‌لا ـ مه‌هاباد ـ نه‌غه‌ده ـ پیرانشار و شنۆی تێدایه و له ته‌واوی ئه‌م مه‌لبه‌نده دا جگه له هێندێک بن له‌هجه هه‌ر به یه‌ک شێوه و زاراوه ده‌دوێن. که به زاراوه‌ی موکری به‌ناوبانگه .

له چاخه کۆنه‌کاندا و ته‌نانه‌ت هه‌تا ده‌وره‌ی قاجاره‌کانیش له ئێران، قه‌لمڕه‌وی ده‌سه‌لاتی موکریان له‌مه به‌ربلاوتر و فره‌تر بووه.

له‌پاش ئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی شاری سابلاغ نزیکه‌ی (٣٥٠) سالێک له‌مه‌وبه‌ر به یه‌کجاری بۆته مه‌کۆی موکریان و نشیمه‌نگه‌ی ئه‌میر و سه‌رداره‌کانی موکری بووه ، ده‌لێن له‌پێش مه‌هابادی ئێستادا شاری دریاس که شوێنه‌واری له گوندی دریازی ئێستا ماوه‌ته‌وه، مه‌کۆی ئه‌م مه‌لبه‌نده بووه .

ئه‌م هه‌رێمه‌ی موکریان له چاخی ماد و هه‌خامه‌نشی و پارت و ساسانیه‌کانیشدا هه‌ر ئاوه‌دان بووه شوێنه‌واری سه‌دان شاره‌کۆن و قه‌لاکۆنی پێش ئیسلام له‌م ناوچه‌یه‌دا هه‌یه .

له‌باری ووشه‌ی موکریانه‌وه وه‌ک ماموستا رۆژبه‌یانی ده‌لێ ده‌گونجێ ئه‌م وشه‌یه له موغ + ریان"ه‌وه هاتبێ و به مانای رێگای موغه‌کان بێ، چونکه له‌م ناوچه‌یه‌دا هه‌ر له چاخه کۆنه‌کانی به‌ر له مێژووه‌وه چه‌ندین په‌رستگه و ئاورگه‌ی ئایینه کۆنه‌کانی کوردی لێ بووه.وه‌ک ئاورگه‌ی هه‌ره پیرۆزی زه‌رده‌شتی‌یه‌کان له نزیک شاری تیکاب ئازه‌رگه‌شـ ـسپ ، که ئێستا به ته‌ختی سوله‌یمان ناوداره ، هه‌روا ئاورگه‌ی لیلانی نزیک سه‌رده‌شت و په‌رستگه‌ی که‌ره‌فتوو له نزیک مه‌هاباد ،واوێ ده‌چێ که له وه‌ختی خۆیدا موغه‌کانی ئاورپه‌رست میترا دین " میترائیسم"و زه‌رده‌شتی له

ناوچەکانی ئێرانی کۆنەوە کە رووبان لەم هەرێمە کردۆ بۆ زیارەت، بەم ناوچەیان گووتووە موغ ریان و پاشان بۆتە موکریان.

ناوچەی موکریان لەباری کولتۆری کوردییەوە یەکجار زۆر دەوڵەمەندە و هەموو جۆرە بەیت و باوێکی کوردی تێدا هەیە و رووداوەکانی مێژووی ئینسانی کوردیش زۆری کار کردۆتە سەر بنەی پێکهاتنی بەیتەکانی کوردی و زۆرجار شوێنی ئەم رووداوانە لە بەیت و شیعری گۆرانی کوردی موکریاندا بە جوانی بەدی دەکرێ.

لەباری هەوا و دەزگای مۆسیقاوە دەتوانین ناوی هێندێ مەقاماتی تایبەتی کوردی کە لە موکریان باون بەرین وەک:

١ ـ حەیران ٢ـ لاوک ٣ـ گولێ، ٤ـ پایزە ـ ٥ـ بەهارە ٦ـ گەلۆ ٧ـ ئازیزە ـ ٨ـ سەحەرە ـ ٩ـ شەونیوەشەو ـ١٠ـ لێلێ ـ ١١ـ قەتار.....

وەئێستا هێندێ گۆرانی فۆلکلۆری تایبەتی ناوچەی موکریانتان پێشکەش دەکەین:

دەچمە سەری سوڵتانی شەمۆیە نایەمەوە
دەس لە کێلان وەردێنم چلدانەی دەگرمەوە
بەختی خۆم و لێوئاڵی بەتاقی دەکەمەوە

شەرت بێ گوڵی کەس نەکەم بە بووە
تا گوڵم بۆ دێ لەلایەن تووە

قەسەم بە رەحمان و رەحیم
هەتا لە دونیایێ بژیم
مەیلت نانێم یاری قەدیم

کاری من نییە کاری خودایە
لەیلا دەوڵەمەند، مەجنوون گەدایە

هەرچەند دەکەم فکر و ئەندێش
تەوەلا بووم لە قەوم و خوێش
لە سوێی باڵات بووم بە دەروێش

کورم گەورە کرد بە قەندی شاری
رەزاشا بردی لەبۆ ئیجباری

یا خودا پەهلەوی تەختی وەرگەرێ
ئیجباری کوردی دەبا بۆ شەرێ

بەهارێ نەمرم مانگی گوڵانە
هاوینێ نەمرم خەڵە و خەرمانە

زستانێ نەمرم بەفر و بارانە
پاییزێ بمرم دەس لێک بەردانە

چەند شاران گەرام چەند خاکەساری
بووم بە شوانەکەی حەق نادیاری

هەر کەسێک بیکا غەریب نەوازی
خودا و پێغەمبەر لێی دەبن رازی

غەریب لە شاران غەریب دیارن
جێگای غەریبان گۆشە و کەنارن

دیسان شەو هات بۆ حاڵی من
لەو دڵەکەی پڕ خەیاڵی من
گەڕەک نانوێ لە ناڵەی من

نەخودا دەمداتێ مەرگێک بەهاسان
نە دڵ لە لای تۆ دەبێ هەراسان

وەک قومری سەربالم شینە
دەچریکێنم بەو هاوینە
کار و پیشەم هەر ناڵینە

سەفەرێکم کەوتە بەر
رێ یە هات و نەهاتێ
چاوەڕێمە لە رێگا
با کاروان بێ و بمگاتێ

نە دەردم وەکوو دەردەدارانە
نە برینم وەکوو بریندارانە

تاکەی دانیشم لەبن دیواران
ئاخ هەڵکێشم وەک لێو بەباران

هاتنەوە تەیری دەگەرمێنێ
هێشتا دوورە و دەخوێنێ
دەمرم دەبەر ئەو تەیرەی
مزگێنی بەهار دێنێ

# ژیانی ئاسایی

نەسرینی جەعفەری

بەیان بەکزەی ساردی زریان
کە لە چیا بەرزەکان بەرە و
شاردەهات راگەیەندرا .چ پێ
نەچوو تیشکی زێڕینی خۆر
وەک مارێکی زەرد بە تەواوی
شاخ ودەمەنی شارەکەمانیدا
گەڕا ،هەموو دەرکی کرد دنیای
شەوی روون کردەوە ،ئاسمانێکی
شین ،هەوایەکی نەرم وهێدی
ژیانێکی خۆش وساکار!

دایک لە خەو هەستان و
مێردەکانیان وەخەبەر هێنا
کەبۆ چوونەسەرکار ئامادە
بن ،تاق ولۆق پیاوو ژن لە
شەقامەکانی شار دەهاتن و
دەچوون .

شیرن لەخەو هەستا ،تەما-
شایەکی سەعاتی کرد ، سەعات
(٦/٥) بوو ،سەماوەرەکەی ئاور
دا،بەرچایی سازکرد ،تەماشایەکی
منداڵەکانی کرد ،لە دیمەنی
جوانی وان بزەیەکی شیرینی
هاتە سەرلێو ،بە دەنگێکی
نەرم ئەحمەدی بانگ کرد .

ئەحمەد ،ئەحمەد ، هەستە
ناچیە ئیدارە!.

ئەحمەد چاوە پڕلە خەوە-
کانی هەڵێنا ،گوتی :

سەعات چەندە؟ شیرن
تەماشایەکی سەعاتی کرد
گوتی :

پێنج دەقیقەی ماوە بۆ
حەوت .

ئەحمەد چاوی لەسەر یەک
دانابۆوە. گوتی :

باشە زووبە .

سەعات حەوت ودە دەقیقە ،
شیرن دیسان گوتی :

ئاخر وەدرەنگی دەکەوی
هەستە تا بەرچایی دەخۆی
دەبێتە هەشت ،خێراکە خۆ
مەگنخێنە .

ئەحمەد هەستا سەروچاوی
شوشت ،ردێنی تاشی هاتەوە
ژوور ،شیرن لەکن سەماوەرەکە
دانیشتبوو ،چایەکی بۆتێکرد
ئەحمەد گوتی :

شیرن چمان دەوێ بیکڕم

شیرن گوتی :

گۆشت وسەوزی وهێندێک
میوە بکڕە ،دۆشخۆم دەکرم.

لەوکاتەدا چاوی بە هێمن
کەوت ،وەبیری هاتەوە قەولی
پێداوە کەوشی بوبکڕێ گوتی :

جووتێک کەوشی جوان بۆ
هێمن بکڕە کەوشەکانی بە
لاقیەوە بەند نابێ .

ئەحمەد بەپەلە پاروەکانی
قووت دەدا ، گوتی :

زووکە چایەکی دیمبوتێکە
درەنگمە شیرن گوتی :

بچۆ ماڵە کاکم ولەگەڵ

خۆتی بێنە ئێرە، لە مێژە
نەمدیوە ئارەزووی دەکەم
ئەحمەد گوتی باشە :.

چاوی لە سەعاتەکەی کرد .

ئای درەنگە چاوێکی لە
منداڵەکانی کرد هەردووک
دەغوڕڕابی خەوێدا بوون ،
دەستێکی بەسەری هێمندا
هێنا ،هێمن جووڵەیەکی کرد .
هەردووکیانی ماچ کردئاوڕێکی
داوە ، گوتی :

خواحافیز شیون-هەتا بەر
دەرگا بەڕێی کرد پاشی دەرکەی
پێوەدا وهاتەوە ژوور ،بۆخۆی
نان وچای خواردو منداڵەکانی
لەخەو هەڵستاند ،دەم وچاوی
شووشتن وچای دانێ ، خۆی
خەریکی کاری بوو زاق وزووقی
منداڵەکان دەگەیە ئاسمان
وڵاتیان وەسەرخۆ گێڕابوو ،
شیون گوتی :

رۆڵە گیان بڕێک سەبر ،
بۆوادەکەن!رووناک دەستی
هێمن بگرە بیبە حەسار ،لەوێ
کایە بکەن تا منیش خەریکی
کاری بم ،رۆڵە گیان بەقوربا-
نووبم زووکەن دەی ،نیوەڕۆ
خاڵۆودێ ،خوائاگاداری بێ..
رووناک گوتی خاڵم دێ ئەدی
زانیار ناهێنێ ،شیون گوتی :

بەڵکوو بیهێنێ!ئافەرین
ئەسباب بازی یەکانیشوو بەرن.
منداڵەکان چوونە حەسار ،
حەسارە خشپێلانەکەیان
باخچەیەکی بچکۆلەی تێدابوو
گوڵیان لێ چاندبوو ،بۆنی
گوڵەئەتڵەس وڕێحانەڕەشە
حەساری پڕکردبوو .لەنێوەڕا-
ستی حەساری ،حەوزێکی
چکۆلەی تێدابوو ، لەبەر
منداڵەکان ئاویان تێ نەدەکرد

رووناک کچێکی ٥ ساڵانەی
زۆر زیرەک ووریا بوو ،چاوی
رەش ،رەش ،دەتگوت شەوی بێ
بنە ،مژۆڵەدرێژەکانی هەر
چاوی داختبا ،نیسێی دەخستە
سەر رووومەتەئاڵەکانی ، زۆر
قسەخوش وخۆڕێخەر بوو ،هێمن
سێ ساڵانە بوو ،قسەلەت و
پەتەکانی کەلە زارە بچووکە-
کەی دەهاتەدەر دەتگوت
قەندە ،چاوی شین ،و قژی زەرد
بوو ،تووکە زەردەکانی
دەتگوت کلووی زێڕیە وەک
دایکی بەدەم دایناب ێ .......

رووناک گوتی :

هێمن من دەبم بەمعەللیم
تۆش دەبی بە قووتابی ، لە
سەردەفتەرێکی کۆن بە
قەڵەمێک خەتی دەکێشا و سەر
مەشقی بۆهێمن دادەدا ، لەو
کاتەدا دایکیان خەریکی ئیشی
ناوماڵ بوو ،لەپەنجەرەوە ،
چاوی بە منداڵەکانی کەوت
دەتگوت جووتێک کۆتری بێ
خەیاڵی ناسک وجوانن لەبەر
خۆیەوە گوتی :

هەک دایک دەسەرو گەڕێ
بەزەیەکی نەرم وشیرین لە
سەرلێوەئاڵەکانی نیشتبوو
سەری داختبوو ، ژووری دەما-
ڵی بەڵام بەزەی سەرلێوی بزر
نەببوو ،بیری لەچی دەکردەوە
بێ شک بیری لە ژیانی
منداڵەکانی دەکردەوە ،ئەودەم
لەسەر تەختی بیمارستان
کەوتبوو وژانی دەهاتێ ، ئەو
کاتدوای چەند سەعات ژان و
برک پەرەستارێک منداڵەکەی
لەسەر باوەشی داناوگوتی :

سەیری کەچەند جوانە ،
دەڵێی لۆکەیە ،هێند نەرمە
ئەویش دەستە چرچ وپیرەڵۆکە-
کەی لەدەستی گرتبوو قامکە
بچووکەکانی قووچاندبوو
دەتگوت دنیای لەمستی گرتووە
ئەوساتە تەواوی ئێش ودەردی
خۆی لەبیر چووبۆوە ،محیببەت
لە دڵیدا وەک کانی یەکی
روون وپڕئاو هەڵدەقوڵی وەک
تەواوی خۆشی دنیا بەجارێک
بێتە نێودڵ ودەروونی وابوو
لەخۆشی یان رەنگە زەردەکەی

سوور هەڵگەڕابوو چاوی پڕلە ئەوین وخۆشەویستی بوو. بە دەنگی منداڵەکان هاتەوەسەر خۆچاوی لەحەوشە کرد، هێمن دەیگوت :

چاو رووناک ئەو کۆترانە!

رووناک گوتی :

دایە،وەرە تەماشاکە ئەو کۆترانە چۆن دەبرووسکێنەوە ئەنگوستی بۆئاسمان راداشت شیون گوتی :

کێهە کۆتر رووناک گیان!

هێمن گوتی :

هاها، تەماشاکە .

شیون گوتی :

رۆڵە ئەوانە کۆترنین فڕۆکەن ،رووناک گوتی :

ئەوی سواری دەبن ودەچن بۆئاسمان ،لەوکاتەدا ئاژیری خەتەریان لێدا ،شیون گوتی :

نەکا پێمان دابدا ،هێمنی لەباوەش کرد ،دژ هەوای یەکان دەستیان بەتەقە کرد منداڵە-کان زۆر دەترسان خۆیان بە دایکیانەوە نووساندبوو ، شیون گوتی :

بابیشوو لەماڵ نیە ،خودا بیپارێزێ .دەستی کرد بە دۆعاکردن وئایەتالکورسی ،فووی بەسەر خۆی ومنداڵەکان داکردو بۆخزم وکەسەکانیشی بەرێ کرد .فڕۆکەکان لە ئاسمانی شاردەهاتن و دەچوون وخۆیان دەنواند ،دەنگە دەنگ وهاڕە ،هاڕ، گوێی پڕ دەکرد فڕۆکەکان دەریچەی سەوتیان کردبۆوە پیاو زەهلەی دەچوو هاتوهاوار وتەقەوچانی نەبوو وساتێک، بێ دەنگ نەدەبوو.

فڕۆکەکان چەند بۆمیان بەسەر شارەبێ تاوانەکەی خانێدا رشت وخۆیان دوور، بوونەوە ،تەپ وتۆز هەڵستا دووکەڵە شینە بەری ئاسمانی گرت ،قرمەی شووشان هاتە گوێ ،خانوو بچکۆلانەکەی ئەحمەد وشیون تێک ڕما شیون ومنداڵەکانی وەبن کەوتن و کەس بەدەنگی نەزانین گرمە

گرمێک بوو وەرە سەیری ئەمجا تەقە بێ دەنگ بوو چەند دەقیقە پێ چوو ،دنیا پڕ بوو لەزیل وبەند ،هات وهاوار و گریان ورۆ ،رۆ، پەیدا بوو، هێندێک پەشۆکابوون ،منداڵ دەیان قیژاند ودەگریان دایک بەخۆیان دادەدا وسەروقژیان دەڕنی ،باب فرمێسکیان لە چاو قەتیس مابوو ،بوغزگەرووی گرتبوون پیرێژن تووک و دۆعایان دەکرد ،یەک جنێوی دەدا ،ئاگری رق وقینی خەڵک پەرەی ئەستاندبوو هەمرو وێکڕا رقیان هەراو بووبۆوەیەک دەیگوت بکەونەبەر نفرینی خوا ،هەک تالەسەر دنیان قەت شەوێ بێ خەم سەر نەنێنەوە هەک لە دونیاو ئاخرەت جێتان هەر جەهەننەم بێ .

مستەکانیان قووچابوو ،نێو چاوانیان گرژ ،رق وقین دڵی داگرتبوون دەیان قیژاند لەنەکاو وەک یەکێک هەرا بکا:

براینە بڕۆینە یارمەتی خەڵکی وئەو لەشە بێ گیانانە لەبن گڵ بێنینەدەر و ئەو بریندارانە بەرین بۆ نەخۆشخانە هەموو خەڵک وەدە-ست وبردکەوتن وهەر یەک بۆ لایەک رایان کرد ئێستا کاتی راوەستان نەبوو ،کاتی لەخۆ

بووردن ویارمەتی بوو .

ئەحمەد لەئیدارە خەریکی کاری رۆژانەی بوو ،لەوکاتەدا ئاژیری خەتەریان لێدا سەرۆکی ئیدارە هاتە نێووەتاغەکان و گوتی :

دیسان هاتن هەستن برۆنە حەوشەی ئیدارە ،ئەگەر لێی دا هەموو وەبن دەکەوین .

هاوکارەکانی ئەحمەد شان بەشانی ئەحمەد هاتنەدەر.... لەشەقامەکان خەڵک هەموو چاویان لەئاسمان بریبوو لەوکاتەدا فرۆکەکان لە ئاسمانی شارەکەدا خۆیان نواندوتەقە دەستی پێکرد کاتێک بۆمبەکانیان رشت هەمو و خۆیان مەڵاسدا .

ئەحمەد دڵی لەجێی خۆی نەمابوو ببو بە کۆترەباریکە ولەسەر ماڵی باڵ وپەڕی لێ دەدا ،لەبەر خۆیەوە گوتی :

منداڵەکان زۆر دەترسن هێمن زۆر ساوایە ونازانێ ئەو تەقەورەقەیەچیە ،رووناک برێک باشترە ،برۆم بۆ ماڵێ بزانم هیچیان لێ نەهاتبێ وەرێ کەوت خەڵک هەر یەک بۆلایەک هەڵ دەهاتن ،ئەحمەد پێشی یەکێکی گرت وگوتی :

دەزانی لە کوێی داوە ،

کابرا گوتی :

من نازانم ،خۆشم لە بازاڕ بووم ،هەرکە هاتنەسەرشارەکە- مان دووکانم داخست وهاتمەوە ئێستاش ئەوە بۆ لای ماڵ دەچمەوە .

ئەحمەد بە رۆیشتنەوە ئەو قسانەی گوێ لێ بوو ، بۆ خۆی نە بدەزانی چون گەیشتەوە گەڕەکی خۆیان ،نومای شار گۆڕابوو .شارە بچکۆلانەکەی بەراستی شپرزە ببوو ، نیوەی خانووەکان هەر ئادار یان بە سەرپادارەوە نەمابوو ، لەو هەموو خانووە خۆش و تازە دروستکراوانە تاک ، تاک بەسەر پێوە مابوون ئامبولا- نسێک بە ئاژیرکێشان لە پەنای رەدبوو ،چاوی بە کووچەکەیان کەوت ، دڵی راچڵەکی رەنگی بزرکا ئارە- قەی ساردی بەنێوچاوانیدا هاتەخوار .بە هەڵاتن چوولای خویان ، بەڵام خانووەخشپیلا- نەکەی خویانی نەناسی یەوە چاوی لەولاو لەملای کرد ،چەند هەنگاو هەڵات گەڕاوە تا پێشترچوو ،دەرکەی ماڵەکەیانی ناسیەوە ،دیوارێکی بەسەردا رووخابوو ،نیوەی لەبن گڵ هاتبۆ دەر خانووەبچکۆلانە- کەی هێلانەی ژیانی خۆی و منداڵەکانی تێک رمابوو وەک شێتان وەژوور کەوت تەنیا سێ چوار دیواری کەچ وکرووچ ، بەسەرپێوە مابوون چۆنێو وەتاخە رووخاوەکان وێنە جوانەکەی هێمن هەر بە دیوارەوە مابوو ،لێی کردەوە ، بەدیوەکانیدا گەڕا بەڵام شوێنەواری کەس دیار نەبوو..

فیزماڵکی بۆحەسارێ دا ، چاوی بە بووکی رووناک کەوت نیوەی لەبن گڵ وخشتەوە وەدیار کەوتبوو گوتی :

بێ شک لێرە بوون ئەژنۆی نووشتاوە چۆکی داکوتا بۆ قەننەکێشێک حەپەسا لەپڕ بە چەنگ ونینۆک وەگڵ وبەردەکەی کەوت وخشت وبەردی وەلادەنا فرمێسکی گەرمی بەردێندا دەهاتنە خوار ،دوای چەند سەعات لەشی بێ گیانی ژن و منداڵەکانی لە بن گڵ هێنادەر .

# سالح شیروان

ها تــه بن گوێـم و بـەسرتـه
گەستی بیـرم زۆر بەسپا یـی
هۆشـم هـا تـەوه بـەرەوخـۆ
ئا خـۆ چیـدەڵـێ لـه دووا یـی

* * *

ووتی، تا کەی خوێنی دەما ر ؟
بکوڵـێ بەتینـی گەرمەتـا و ؟
لـه ئا ویلکـەی مەرگ و ژیا ن
وێـم را نا گا قومۆکـێ ئـاو !؟

* * *

شەکرا وی ئەمجا رەی ئەویــن
بە ئەوکی کـێـدا رۆ دەچـێ ؟
گا ڵتـەی شەوگـا ری لاوەتـی
کوا ؟ بڵێـی بەفیرِو بچـێ !؟

* * *

وەرزێکی تا زە دووا ی بەهـا ر
بەها رێکـی سـەوز دێنـێ ؟
لـەم پەستەڵە کە چەتوونـه
مەلـی ئا وا ت دەکورکێنـێ ؟

* * *

خوێنـی گـەشـی لـەشـی خونچـه
دەگرێ دەمی تیخـی دەبـا ن ؟
لـەنێـو تا سە و گرِ و هـەستـا
دەروێ دروِوی زین و مەما ن !؟

* * *

بیــری ووردی کۆنسـا لان
وەکـی وەجا خما ن سـەوزە؟
رووبـا رما ن لـه خـرۆشـه ؟
یـا گەنیوه بەتوێی قەوزە ؟

* * *

ئیستا ش ئەم خا کە پیــرۆزە
سورمەی چا وی کیـژۆلانـه ؟
شیعری پا را وی کوردی یە،
شەو چەلـەی کـۆڕی شەوا نه ؟

* * *

"ئێستا ش کەفا رسی شەکەرەن"[1]؟
"کوردی گەلـی شیرینتـەرەن"[1]؟
ئێستا ش کورِوکا ڵ و هــۆزن
تینوو ی ئەدەب و هونەرەن ؟،

* * *

لـەسـەر ئەم خا کە، خا کیمـه
بۆ شەرِی بوون پلانـم هـەس
بۆ دا ها تـووی مزرو شیـرن
نەما می ئەرخەوا نم هــەس

# شەماڵی جودایی

" فیداکاری تۆم "

سروە نەهاتی پشت چەمایەوە
پاش تۆئاورم گرت نەکووژایەوە

پەیمانت وابوو جێمان نەهێڵی
دیارە بە وەفای واگەڕایەوە

بە خێر بێیتەوە ئەی یاری دێرین
بەو بۆنە خۆشە وبەو هەوایەوە

لە سەر خۆهاتی بەسەر وەڵاتا
تەم وغەم نەما تەم ڕەوایەوە

عەتری گوڵانت بەدیاری هێنا
شەکەت و ماندووت پێ حەسایەوە

کە بێنی خۆشت هێنا بە رووما
گلێنەی چاوم پێت گەشایەوە

نەسیمی تۆ بوو بەری بەیانی
بیری پیاوانی هێنا کایەوە

# عیرانی لاو

دیارە تۆ فێنکی و فێنکی دێنیت
بەڵام پشکۆی کورد پێت بووژایەوە

کورد لە مێژ ساڵە چاوەڕێی تۆیە
ئاخ هەڵ دەکێشێ بەو تەمایەوە

گەر قەبووڵم کەی فیداکاری تۆم
بە گیان و بە دڵ بە سەرمایەوە

"شەماڵ" مەناڵە سروە کۆرپەیە
بیلاوێنەوە شەو بە لایەوە

# خەیاڵ

ساڕێژی زامی دەروون
بزوێنەری ئەشکی روون
ئیلهامی شیعری خەمین
چۆلەکەی باخی ئەوین
تێشوو بەرەی خونچەی دڵ
ئەی ڕێبواری کووچەی دڵ
خەیاڵ دەی وەرە ساتێ
دووری دەنگم ناتگاتێ
یارم جێ دێڵم بەڵام
چیا دەشێلم بەڵام
ئاهی ژینی بەیانم
هات وچۆی بیرەکانم
دڵم پڕدە کەن لەقین
بەرەوژینم دەبەن ژین
بەهاواری دڵی سووت
هەستی شێعری خوێن بزووت
ئەی هاودەمی ژین دەمێک
وەدەستم دە مەر هەمێک
بەڵام خەیاڵ دەزانم
کە دوور دەبێ بڕوانم
رابردووی دەفتەری عیشق
لەسەر ژین گوزەری عیشق
تەنیا ناکامی یەو بەس
کەسی پێ نەگەیی کەس

وێڕای داخ وپەژارەیەکی زۆر لە شەهید بوونی هاوکاری بەڕێزی "سروە" کاک خالیدی زاهیدی "ئارام" بۆبیرەوەری لە رووحی پاکی ئەم شەهیدە ئەم پارچە شێعرە بە ناوی خەیاڵ،کە لە شێعرەکانی خۆیەتی بڵاو دەکەینەوە

رووحی شاد بێ

"جان لاک" یەکێکە لەزانا کانی سەدەی حەفدەهەم کوتوویەتی :"مێشکی منداڵ وەک تابلۆیەکی پاک وایەکە هەموو جۆرە فێربوونێکی لە سەر نەخش دەگرێ .

زانستی ئەمرۆ بایەخێکی زۆردەدا بەو ووتەیەی جان لاک هەر بەوبۆنەوە رەفتارناسان (روانشناسان )ئەمرۆ بۆ فێرکردن و بارهێنانی منداڵ بایەخێکی زۆر دەدەن بەجیهانی دەوروبەری.

یەکەمین جیهانی منداڵ لەدوا لەدایک بوونی ناو خێزانە . خێزانە کەقەوارەی، کەسایەتی بۆمنداڵ دەدروێ و دەیکاتە بەری وپاش چەندساڵ بارهێنان وهەڵسەنگاندن دەینێرێتە ناوکۆمەڵ.

بارهێنانی منداڵان گرنگترین بەرنامەی ژیانی ئێمەیە .

منداڵانی ئێمە داهاتووی وڵاتەکامان دادەرێژن ئەوان مێژوو دروستدەکەن وباوکان ودایکانی داهاتوون .ودەبن بە داهێنەرانی داهاتوو بۆ منداڵەکانیان .

لێرە داپرسیارێک دێتە پێش ،کەی دەست بکەین بەو گرنگترین بەرنامەی ژیانمان ؟

لەئەفسانەیەکی کۆن دا کوتراوە کە دایکێک لەگەڵ منداڵەیەک ساڵانەکەی خۆی چووە لای زانایەک پرسیاری لێ کرد "پێم بڵێ لە چ تەمەنێکەوە دەست بکەم بە بارهێنانی منداڵەکەم؟ "

پیاوە زاناکە بەوردی سەرنجی دایە منداڵەکە و هەوڵی دا تاسن وساڵی ئەو بدۆزێتەوە ئەو کات وەڵامی داوە :

"خانم تۆ بارهێنانی منالەکەت دوازدەمانگ وەدوانگی خستووە .

مەبەستم ئەوەیە کەبڵێم منداڵ لەو رۆژەوەکەدەکەوێتە ناوخێزان و لەلەشی دایکی جیا دەبێتەوە دەبێ زۆر بە زیرەکی بۆ بارهێنانی هەوڵ بدرێ .

کردارناسانی ئەمڕۆهەموو باوەڕیان بەوە هەیە کە ساڵەکانی هەوەڵی تەمەنی منداڵ بۆفێرکردن وبارهێنان زۆرگرنگترن لەساڵەکانی دوایی .

یەکەم باخچەیەک کەمنداڵ مەلی لەشی خۆی تیا دەحەسێنێتەوە داوێنی پڕ لە خۆشەویستی دایکیەتی . و دایکی یەکەم مامۆستاویەکەم قوتابخانەیە بۆئەو .بەڵام قوتابخانەی دایک لەهەموو قوتابخانەکانی تری کۆمەڵ گرنگترە .چوونکە لە وێدا بەردی بناخەی کەسایەتی ئەو دادەڕژێ .و بناخەی دیواری لەوێوە هەڵدەستێ .

یەکەمین شتێک کەمنداڵ دەیناسێ رواڵەتی دایکیەتی هەوەڵین زەردەخەنەی منداڵ لەتەمەنی چوارمانگیدایە و

ئەوەش وەلامێکە بۆ پەروەردە خەنەکەی دایکی . دەمەوێ ئەوە بڵێین کەدایک گەورەترین مامۆستای ژیانی منداڵە .

پرسیارێکی تریش کە دەکەوێتە بەرچاو ئەوەیە کە لە کوێوە دەست بکەین بە بارهێنانی منداڵەکانمان ؟

لە وەڵامدا دەڵێم :گومان مەکەن کەتەنیا کاتێک منداڵ تەربیەت دەکرێ کەقسەی لەگەڵ دەکەن ،یاشتێکی فێردەکەن ، یافەرمانێکی پێ دەدەن بەڵکوو لەهەر کاتێک لە ژیانداتۆ خەریکی بارهێنانی منداڵەکەتی تەنانەت ئەوکاتەش کەتۆ لە ماڵ نی .

چۆن جل وبەرگ لەبەردەکا چۆن لەگەڵ خەڵک قسەدەکەی و چۆن سەبارەت بەوان دەدوی، چۆن پێ دەکەنی ،لە گەڵ دۆستەکانت رەفتارت چۆنە چۆن رۆژنامە وگۆڤار دەخوێنیتەوە ،چۆن خواردن دەخوا ...هەموو ئەمانە بۆ منداڵ بایەخ دارن ، لەچکۆلەترین قسە گۆڕکێ ی تۆ تێ دەگا . تەواوی بیروڕا و کردەوە چەوتەکانی تۆلە منداڵەکەتدا شەوق دەداتەوە.

ئەگەر تۆ لەماڵدا تووڕە بی و خۆبەزل بزانی و رەفتاری ناشایستەت هەبێت و خراپترلەهەموو شتێک ئەگەر دایکی منداڵەکەت جەزرەبەو ئازار بدا . ئەگەردایکیشیت و لەگەڵ باوکی منداڵەکەت رەفتارێکی باشت نەبێ . ئیتر نابێ بەهیوای باش بار هێنانی جگەرگۆشەکەت بی . تۆ بەکردەوە خەریکی خراپ تەربیەت کردنی منداڵەکەتی :جائیتر تەنانەت باشترین رێنوێنەکان و شێوەکانی تەربیەتی ناتوانێ یارمەتی بدا ، چوونکە یەکەمین گەلالەیەک کە منداڵ دوای دەکەوێ شێوەی رەفتاری دایک وباوکی یەتی .

تۆدەبێ لەهەموو کاتێکدا و لەهەموو شوێنێکدا و لە هەموو کردەوەیێکدا لەبیری بارهێنانی منداڵەکەتدا بی .

تۆدەبێ بەباشی بزانی کە منداڵەکەت چی دەکا لەکوێ یە یا لەگەڵ چ کەسانێک هاودەمی دەکا . هەرلەو کاتەشدا دەبێ ئازادی پێویستی بدرێتێ بۆئەوەی نالەبارێیەکانی ژیان بناسێ و تاقی بکاتەوە دەبێ بەجۆرێک پەروەردە بکرێ کە سەر لەهەموو ئەوتەنگ و چەڵەمانە دەربێنێ . بەم شێوە ئەرکی تۆ تەنیا رێ پیشاندانی ئەوە لە ژیاندا ئەمە بەو مانایە نیەکەدەستی منداڵە کەبگری و دایمە لە بری ئەوبیربکەیتەوەوبەجێی ئەو رەفتار بکەی

بارهێنانی منداڵ پەیوەندی پەرێکخراوەیەک،هەیە کە تۆ لە خێزانەکەی خۆتدا دروستت کردووە .

پەیوەندی بەکەسایەتی تۆ بەشێوەی تێکەڵ بوونت لەگەڵ کۆمەڵدا هەیە .

کەوابوو بۆ بارهێنانیمنداڵ هیچ شتێک لەهیچشتێکی تر چکۆلەتر یاگەورەتر نیە . هیچ کردارێک لە کردارێکی تر بایەخ دارتر یان بێ بایەختر نیە .

لەبارهێنانی منداڵدا کردەوەیەکی بێ مانایان پڕمانامان نیە .

جاری واهەیە کارێک کەبەبیرو رای ئێمە زۆرسادەولاکەوتەیە ئەنجامێکی ،ئێجگار گەورە دروست دەکا .

گوڵێک کەبەمنداڵەکەتی دەدەی ماچێک کەلەمنداڵەکەتی دەکەی ،زەردەخەنەیەک یان تووڕەبوونێکی سادە هەر کامەیان لەوەختی خۆیدا بەرهەمێکی باشی لێ وەر دەگیرێ .

لەکۆتاییدا ئەوەبڵێم کە دروست بارهێنانی منداڵ زۆر هاسانترە لەچاک کردنوپینەو پەڕۆ کردنی کەلێنەکانی خوو ورەوشتی ئەو .

هێشتا شەو لەسەر زەوی زاڵە وپەرژینی رەشی تاریکی برستی رۆیین لەرێبوار دەستێنێ . پۆل پۆل ئەستێرە لەئاسمانی رەشداگەڕاوی شار دا کەوتوونەتە چاوەبرکێ و وەک هاتبنە ژوانی شەو ، باوکیان کۆڵ کێشی وبارەبری دەکرد،کەچی لەچارەی رەشی منداڵەکانیئەویش ماشێن لێی داو تەنیا داشقەیەکی تێک وپێک شکاوی لەپاش بەجێما . ئەرکی گرانی مەعاشپەیدا کردن کەوتە ئەستۆی دایک دەرمان مانەوە .

"خاتووزین "بەئەسپایی لەجێگا دێتە دەرو بەرلەوەی بروا بۆسەر کار ،بەهێوری و بێئەوەی منداڵەکان راپەرێنێ یەک یەک کولمەیان رادەمووسێ وئاخێکی سارد وسرلەناخی

# گوڵی کەم خایەن

ق. بابامیری

هەموو پەناو پەسیوی ژوانگەی ئاسمانیان تەنیوە . لەژووری کۆختەیەکی بچکۆلانەدا ،چەند منداڵی کزو زەردەلە لە تەنیشت دایکیانەوە خۆیان کێشاوەتە بن لێفەیەکی بەرینی پواو. چاوەکانیان لێک ناوەوخەیاڵ بەرەو دوورە بەستێنی دەریای هەژاری و دەسکورتی سەولی داون .

وندداری وبێبژیوی هێندەی دیکە ئەوکی رێک کوشین چارەرەشی و پەژارە رۆژ لە گەڵ رۆژ زۆرتری قورسایی دەخستە سەر شانیان خونچەی ئارەزوویان پێش پشکووتن هەڵپسان .تێکۆشانی دایکیش هەرتوانی تارادەیەک بەری برسیایەتی بگرێ وهەزار ویەک دەردی دیکەی ژیان بێ دەروونی ئاگرینیەوە هەڵدەقولێ . دەمێک چاوەلێڵ وپڕئاوەکانی لەسەر رووومەتی هێوۆی کچی رادەگرێ وبە راوێژێکی بێ دەسەڵاتانە لە بەر خۆیەوەدەڵێ: هێوۆگیان ، گەورەکچی دایکی خۆت ،چاوی دایکت کوێر بێ دەزانم کراسەکەت شڕ بووە وچیدی بۆ لەبەرکردن نابێ بەڵام چ

بکەم ...ئاخێکی دیکە کەزیە
نەرم و جوانەکەی هێرۆ
دەبزێوێ ودلۆپێک فرمێسکی
خەم لە چاوی سووری دایکەوە
دەتکێتە سەر گۆنای زەردی
هێرۆ .

ورده ورده شەو دەگلێ و
ئەستێرەکان درشت وورد لە
دەشتی بێ بڕانەوەی ئاسماندا
دەتوێنەوە . لەئاسۆی پشت
ڕێزەکێوێکەوە رووناکی ورده
ورده بەرە وژوور دەخوشێ
وخەرمانی عومری شەو بەبا
دەکا . خاتووزین بەبێ دەنگ
دەرگا دەکاتەوە وبەرەو
ماندووبوون، بەرەو
نانەواخانە دەکەوێتەرێ .

چەند رۆژ بووهێرۆ داوای
کراسی دەکرد .خاتووزین
ئەگەرچێ زۆر ماندوو دەبوو
بەڵام هەر دەیتوانی زگی خۆی
وچوارمنداڵەکەی زۆربە زەحمەت
وچەرمەسەری تێربکاو کرێ
خانووش بدا . لەسەرئەوەش ڕا
پێی خۆش نەبوو بێ دڵی بکاو
بەڵێنی دابوویە بۆ جێژن
کراسی تازەی بە دڵی خۆی بۆ
بکا . دەنگی ناسک ومنداڵا ـ
نەی هێرۆ هەرلەگوێی دا
دەزرینگاوە کە دەیگوت:
دایە زۆرم ئیشتیا لە کراسی
سوورە . سەیرانی ئاراڵیشم
بابی لەو رەنگەی بۆکڕیوە
کاتێک باسی باوکی سەیرانی
کردباوکی لەدەست چووی خۆی
هاتەوەبیرو پرسی :دایە بابی
من بۆچی مرد؟ بەڕاستی بۆ
چی مرد ؟ ئەوە پرسیارێک بوو
کە لە دوێنێوە هێلانەی لە
مێشکی خاتووزیندا کردبوو و
وەک خۆرە دەیخوارد .بە
دەم خەیاڵاتانەوە سەری لەبەر
خۆی نابوو و رێگەی دەبڕی .
کەوەخۆ هاتەوە چەندهەنگاوێک
لەنانەواخانە دوور کەوتبۆوە
لۆمەی خۆی کرد ولەبن لێوەوە
گوتی : شەیتان بە لەعنەتبێ
ئەوە بۆ وام لێهاتووە؟
تاوێک راوەستا .قۆڵچاخەکەی
توند کرد ،سەرپێچی لەسەر
بەستودەرگای رەشی نانەوا ـ
خانە بەپەلە قووتی دا .

هێرۆ ورده ورده فامی
کردبۆوە وجیهانی دەوروبەری
دەناسی .کەم وکووڕی ژیانی
هەست دەکرد وگرینگ تر لە
هەموان غیرەت ولەخۆ
بووردوویی دایکی دەدیت کە
چۆن بۆپاروەنانێکی بێ مشەت
لەتاریک ورروونی بەیانیەوە
تائێوارە بەرووی سوورەوە بێ
وچان زەحمەت دەکێشێ
رۆژێک جل شۆری ماڵان
دەکا ورۆژێکیش لەبەرتینی
تەندووری نانەواخانە
دەتوێتەوە ،تەنانەت کاتی
پشوودان وحەسانەوەش بێکار
راناوەستێ وتەشی بۆ خەڵک
دەرێسێ .

بەڵێ هێرۆ ئیدی منداڵ
نەبوو ،دەردی نەبوونی لە
چاوە کزەکانی دایکیدا
دەخوێندەوە هەربۆیەش بۆ
ئەوەی لایەکی لەگەڵ دایکی
گرتبێ ویارمەتی دابێ ،ئەرکی
ئاگاداری لە خوشکەکانی وە
ئەستۆ گرتبوو ،رۆح وگیانی
لەسەریان بوو ، لەکۆڵی
دەکردن ،دە ئامێزی دەکێشان،
رای دەمووسین‌ودەیلاواندنەوە
ئاخر هێرۆش کچی خاتووزین
بوو ،دەبوو نموونەی فیداکاری
ولە خۆبووردوویی بێ .

ئەورۆژە خاتووزین دەمێک
فکروخەیاڵ ماوەیان نەدا .
وتەی دوێنێی هێرۆ هێندەی
شوێن لە سەرهەستیدا یکانەی
دانابوو کە دڵی پڕ بوو.بو ـ
غزگەرووی رێک دەکوشی و
دەیخنکاندەوە پێویستی بە
هاودەمێک بوو تائەوەدەردانەی
کە لەبیابانی بیریداکەڵەکە
کرابوون ، لەلابدرکێنێ و
پڕێسکەی دڵی بۆبکاتەوە .
خەمێکی گران دەیتواندەوە
هێرۆ داوای کراسی دەکرد و
دایکیشی دەیزانی کەهەر بە.
تەنیا ئەو رووت نیە،
بەڵکوو باقی‌منداڵەکانیش
هێندە کۆک وپۆشتە نین وبۆ
خۆشی دەستی کورتە وبەزۆر
بژیوێک بۆزیندوومان‌وەدە ست
دەخا .

ئێوارێ وەک هەموو رۆژێ
کولوانەکەی راخست ،چەند
نانی تێوەپێچا ودیسان بە دەم
خەیاڵاتانەوە هێدی هێدی‌بەرەو
ماڵ بۆوە .منداڵەکانی
دەمێک بوو لەبەر تینی کزو
بێ گیانی تاوی ئێوارە خۆیان
هەڵخستبوو وچاوەڕێ بوون .

خاتووزین دەرگای قەڵشتەوە ومنداڵەکان لەدوورەوەبەرەو باوەشی فڕین .تێر تێر بەخۆیەوە کوشین ویەک یەک کوڵمەی راماووسین .هێرۆ ماندوو نەبوونی لێکرد و بۆ دڵخۆشی پتری دایکی ،بزەیەکی شیرینی هێنایە سەر لێوە ناسک وجوانەکانی وتاوێک تێی راما .

بەو شێوەیە رۆژیەک لەشوێن یەک تێپەر بوون . هاوین زۆری بە بەرەوە نەمابوو گەلاوێژ ئەنگووتبوو شنەیەکی فێنک شارە جوانەکەی مەهابادی بەئەسپایی باوەشێن دەکرد پۆلێک خانووی بچکۆلانە لە داوێنی گەرمی داشامەجیداوەک کۆرپەی ساوا خەوبردوونی‌یەوە .کچۆلان بە گۆزەوە شل ومل دادەگەرێنە سەرشێوەئاوەکەی بەرمالان وەک کۆلکە زێرینە.

هێرۆی وردیلانەش لەقەراغێکەوە کپ وخامۆش ،چاوی بریوەتە گومبەزە پیرولەمێژینەکەی بوداق سوڵتان . کەس نازانێ کەنگێ لە ئاسمانی‌بێ سنووری خەیاڵدا ،تاسەی فرین لە سەر دەردەکا .دڵی هێلانەی هەزار ئاواتی شیرین وپرشنگدارە ، تاوێک خۆی لە تەنیشت ئاواڵەکانی لە قوتابخانەدا دێتە بەرچاو و دەمێک لەپەژارەی بێ ئەنوایی خوشکەکانیدا وەک مۆمی داگیرساو ، تک تک دەتوێتەوە .هێرۆ بەئاواتەوە بوو وەک دەستە خوشکەکانی، بچێتە مەدرەسە وفێری خوێندن و نووسین بێ . بەلام ئەوەش هەر خەیاڵێکی شیرین بوو و هیچی دی .

چەند کیژۆڵەویکرا هاواری دەکەنێ : هێرۆ هێرۆ ،خێراکە نۆرەی‌تۆیە . هێرۆ رادەپەرێ وبەپەلە گۆزەکەی پردەکا .

چاوێک بە دەور وبەریدا دەگێرێ ووەک بەخۆی داشکا-بێتەوە ،سەری دادەخاوبەرەو ماڵ هەلدەکشێ .

رۆژ وردەوردە لەئاسۆی تاقەدارەوە ماڵئاوایی لە شار دەکا . درەنگە ،بەلام خاتووزین هیچ سۆراخی نیە دڵەکوتەیەکی بەسام هێرۆی داگرتووە و بۆ ئەوەی منداڵەکانی دی بزرکاوی لە رووممەتیدا نەبینن ،بەزۆر زەردەخەنەیەک دێنێتە سەر لێو بەلام لەدەرووندا ، دەکولێ ونازانی بۆ کوێ‌بچێ وسۆراغی دایکی لەکێ پرسێ. ناعیلاج لەقولینچکی هۆدەکەوە منداڵەکان لەخۆی کۆوە دەکاو گوێ بۆ دەنگی دەرگا هەلدەخا

رۆژ درەنگ و درەنگ تر دەبێ ونیگەرانی هێرۆدەگاتە ئەو پەری خۆی .

ناهومێد ولارەمل ،هەلدە-ستێ وکەولەکە رادەخا شێو دەدا بەخوشکەکانیو دەخەویان دەکا . ئەوجار هەر دووچۆکی لەئامێزدەگرێ فرمێسکێ لە قوژبنی چاوە

گەشەکانی رادەخزێنە سەر کولمی وبەدەم هەنیسکانەوە ئەویش خەو دەیباتەوە .

بەیانی دەنگی تەقولبابی دەروازە رای دەپەرێنێ .

بەو هیوایەی کە خاتووزین بێ ،بەپەلە رادەکا و دەیکاتەوە . لەپشت دەرگاوە ژنێکی گەراوە کەلەبەرگەکانی راواوێ دەچوو هاوکاری خاتووزین بێ، سلاوی لێ دەکا ودەپرسێ :

ئەرێ کچم ماڵە خاتووزینێ ئێرەیە ؟"

" بەلێ ئێرەیە ، بۆچیتە ؟"

حەتمەن ،ئەتۆش هێروی

"بەلێ لەبەرچی دەپرسی "

"کچم دایکت برێک ناسازەو ئەوەلە بیمارستانێ کەوتووە داوای تۆدەکا ،خێراکە با بڕوێن " .

ئەو وتەیە رەنگ بەروخساری هێرۆوە نایەلێ و وەک لە پێشدا چاوەروانی ئەوو

بڕوانە لاپەڕەی ٧٧

# هونەر و هونەرمەندانی کوردستان

# حوسێن شەشە

"جەعفەری خادمی"

ئەم هونەرمەندەی لێرەدا ، دەمەوێ بیناسێنم **حوسێنی خۆش ئاوازە** کەبە **وسێن شەشە** بەناوبانگە .بەیت بێژودەنگ خۆشێکی هەڵکەوتەیەودەستێکی بەرزیشی لە شیعرگوتن داهەیە

مام حوسێن لە ساڵی ١٢٩٠ی کۆچی هەتاوی لەبنەماڵەیەکی هەژار لە ئاوایی**شەرەفکەندی** ناوچەی **مەحاڵی ئاختاچی** لە دایک بووە وهەرکە فامی کردۆتەوەکەوتۆتە وڵاتی شارۆیران .

ئەویش وەک باب وباپیران لەسەر زەوی یەکی بچووک خەریکی کشت وکاڵ بووە . لە ساڵی ١٣١٥ لەگوندی **قەڵاتی سەربەسری** ژنی هێناوەوهەر لەوساڵەشدا لەترسی خزمەتی سەربازی لەگەڵ بنەماڵەکەی پەنا دەبەنە بەر لێرەوارە-کانی ناوچەی سەردەشت .

دەنگ خۆشی نیعمەتێکی خودادادەیە .**وحوسێن شەشە** لەم نیعمەتە بەهرەوەر بووە . لەزۆر جێیلان داوایان لێدە کرد بۆیان بڵێ .ئەویش دڵی دۆست وئاواڵ وناسیاوانی نەدەشکاند وتێی هەڵدەکرد . وردە ،وردەلەوە ڕادەستی بە گۆرانی گوتن کرد .

زوربەی بەندەکانی بۆخۆی

ڕێک دەخستن وزۆرجار شیعریشی دەگوت بەڵام بەداخەوە نەخۆێندەوار بووونەیتوانی بیان نووسێتەوە وزۆربەیان لەبیر چوونەوە .

سالی **١٣٢٠** کەسالی تەفروتونا بوونی رژیمی رەزا خان بوو ،لە لێڕەوارەکانی ناوچەی سەردەشتڕا دادەگەڕێتەوە ولاتی شاروێران .
لەوێش دەگەل ئەوەداکە ناسراوبووخەلکی ناوچە بۆ شایی وزەماوەند لێی دەگێڕنەوە وبەم چەشنە ناوبانگ دەردەکا .

سالی **١٣٢٦** زەبریکی دلتەزێنی وێدەکەوێ وخێزانی ئەمری خودا بەجێ دێنێ و دوو مندالی لەپاش بەجێ دەمێنێ . هەرلەوسالەدا سەرلە نوێ دەکۆچێتەوە ناوچەی سەردەشت ومندالەکانی دەباتەوە مالی بابی خۆی وبۆبابی بەجێ دێلێ.

لەوسەفەرەدا لەناوچەی گەورکی سەردەشت لەدێی پاراستان بۆدووهەمین جار زەماوەند دەکا ،کەندوکۆسپی رۆژگار کە وەک ئاوالێک هەمیشە لەگەلی بووە پەڕیوەی کوردستانی عێراقی دەکا و ماوەی ٥ سال لە "**هەلشوێ**" بنەگر دەبێ

لەوێ لەگەل خوالێخۆش بوو "**خدرەرەقە**" ئاشنا دەبێ . خدر شایەری بابەکری سەلیمئاغا بووە. زۆربەیتی فێردەکا .

دەستی دەگرێ ئەوانەی نایانزانێ فێردەبێ .ئەو بەیتانەی لەوێ فێریان بووە بریتین لە**لاس وخەزال ـ شێخ فەرخ وخاتون ئەستی ـ کاکە میروکاکەشێخ ـ بەیتی عەلی بەردەشانی ـ میهرووەفا لەشکری سەعیدبەگ ومیرسێوەدین ـ سوارۆی ئایشەگول خەج وسیامەند .**

لە پێشدا ئەوبەیت و گۆرانی یانەشی دەزانی .
**ئازیزە ـ پاییزە ـ گەلۆ تەیری گەرمێنێ ـ تیرۆکە لانکی ئەسمەرێ ـ سێ سوار راوەچ راوە ـ بەهارە ـ کاکە نەبی ونەعمان ـ بەیتی حەتەم گولێ گولێ ـ شەوونیوەشەو شەم وشەمزین ـ سام سام سینەم .**

لە عێراقیش لە زوربەی زەماوەندەکاندا بەشداری دەکرد .لە **بێتوێن وسەرکەبکان ،** کە دێی هەباسی مامەندئاغا بوون دیسان لە **خدرانێ** و **ئالبلاغ** لەپەنا شاری **سلێمانی** چووتە زەماوەند .لەوماوەیەدا سەری لە **کەرکووک وهەولێر و رانیە وقەلادزێ وئالتوون کۆپری وسەنگەسەر** هەلێناوە .
لەوگەڕان وسووڕانەوەدا لەگەل دووهونەرمەندی گەورەی عێراق وەک مامۆستا **تاهیر تۆفیق ورەسوول گەردی** ئاشنا بووە ولێیان نزیک بۆتەوە و ماوەیەکی دەگەل ئەوان رابواردووە .

پاش ماوەیەک گەڕایەوە ولاتی کوردستانی ئێران ولە ناوچەی **سۆیسنایەتی** لە گوندی "**بووبان**" نیشتەجێ بوو.

ئیدی لەوسەردەمە بەدوا دەستی لە گۆرانی کوتن هەلگرت وتەنیا جار وبارە بەیتی دەگوتنەوە .ماوەی سی ودووسال لەودێ یە بوو . پارەکەش کۆچی کردوئەودێ بەی بەرەو (واوان) بەجێ هێشت .

دیلربوو ماندوو بووە .
بەیتەکانیم بیستبوو بەلام دەمویست بزانم شێعرەکانی چۆنن ،ئایادەتوانێ شێعریش بلێ ،یالەوانی پێشتر گوتوونی لەبیری ماون ؟

قەلەم وکاغەزەکەم دەرێنا ، ئەویش دەستی رۆهێشتە گیرفانی وبەکاوەخوتووتن وپەرەکەی دەرێنا . جگەرەیەکی هەلبەست ودایگیرساند . دوایە وردە وردە دەستی پێکرد

### شیعری

خۆشە سوزەی کوێستانێ
مالّ هاتووتە لێنانێ
دەگەلّ گورەی شەمالّی
نەرمە خوناوکەی بارانێ
تاولّ و رەشمالّیان هەلّدا
لەنێو شۆڕە بیزانێ

* * *

خۆشە سۆزەی کوێستانێ
مالّ دەچن بۆ هەواری
کیژ و کوڕ حازر دەبوون
لەپێش کۆچ و کۆچباری
تاولّ و رەشمالّیان هەلّدا
لەنێو گولّ و گولّزاری
ئاونگی سەر سێوەڕە
وەکوو دانەی مرواری

* * *

بۆنی سوێسنە وهەلالان
دەگەلّ پەلکی شلێرێ
هەلّزو بیزا و مەندوکی
دەگەلّ گولّی کەنێرێ
ئاوی بن رنووبەفران
لنەمێرگان دەدێرێ
لەبلّیندان دێنە خوارێ
محەلی خێر وبێرێ

* * *

کیژو کوڕ لە کوێستانێ
گەینە خۆشی و مرادێ
رۆژێ دەچن بۆ شاخی
هەتا ئێوارە دادێ
گەر ئێواران دێنەوە
دێنن کارگ وکوڕادێ

* * *

هەلّزو بیزای نیسێیان
کارگ و کوڕادی بەرپالّی
لەقریوەی شوان وبێریان
لەدەنگی مەرو مالّی
پۆل بەپۆل دێنە خوارێ
بێری برایم جەلالّی
شوان لەدوای مەڕی دەڕوا
خۆش لێدەدا شمشالّی

* * *

محەلی نیوە رۆیان
مەڕ دێتەخوار بۆبێرێ
شوان لە دوا مەڕی دەڕوا
خۆش لێدەدا بلوێرێ
هەرسێکیان شەنگە بێرین
ئامین وئایش ومێرێ
کیژ وکوڕ بە سۆرانیان
لێکرا دەکەن هاوێرێ

* * *

ئایش دەلێ :هۆی فاتم !
فاتم دەلێ : ئامینێ !
توور وشیرمەشکان سازکەن
بابچین بۆ مەڕدۆشینێ
مەرنایەتەوە مالّێ
ئەوەلّ رۆژی هاوینێ

* * *

ئەو کوێستانە دەیبینی
هیند سوورە دەلّێی بووکە
هەر لاخرێکی دەیبینی
پڕ لە خونچە و گولّووکە
جێگای بەویسحەت کوێیە
مەیدان چۆغەو بەردووکە
لەبن سێبەری بییان
ئاوی زۆر ساردەوسنووکە

---

پاشماوەی گولّی...

هەوالّە بوو بێ دەست دەکا بە شیوەن وگرین وژنەش وێڕای ئەو لەبانگ دەدا .

سەعاتێک پاشان لەسالۆنی نەخۆشخانە هێرۆ بەدەست دوو پەرەستارەوە بوو و خۆی رادەپسکاند و بەگریانەوە هاواری دایکی دەکرد وبەخۆی دادەدا .

بەلّێ رۆژی پێشوو خاتووزین لەتەندووری نانەواخانە

کەوتبوو وئاگربەشی زۆری لەشی سووتاندبوو . تاماوەیەک بەرلە گەیشتنی هێرۆ، هەر گیانی لەبەر دامابوو هاواری منداڵەکانی دەکرد . پاشان وردە وردە پێلوەکانی قورس بوون و جیهانی پڕ لە چەرمەسەری ورەنج وخەم و پەژارەی جێ هێشت و چاوەکانی بۆ ئەبەد پێکەوە نان .

مانگە شەوێکی خۆشە و مانگ دەڵێی کیژێکی جوانە چارشێوێکی گوڵ ئەستێرەی تەخت رەشی پێدادا وە،دموچاوە سپی یەکەی وەدەر خستووە، قیرەقیڕی بۆقەکانی بەستێنی چۆم شەویان پڕکردووە،لەبەر هەیوان دانیشتووین .منداڵەکان خەریکن پێکەوە کایە دەکەن وخێزانیشم لەگەڵ منداڵە چکۆڵەکە خەریکە .

منیش کتێبێکم بەدەستەوەیە دەیخوێنمەوە .دەستمدا لیوانەکە چۆڕێک ئاوبخۆمەوە کەچی قیژەی ژنێک ولاتی لەرزاندەوە .هەر ئەوەندە بڵێی یەکودوو لەگەڵ منداڵان وادەرپەڕیمکەوەختا بوو ئەستۆشم بشکێ .

کاتێک چوومە دەرێ دیتم دەروجیرانەکانی دیش هەموو سەریان وەدەرناوە و لە ماڵی کاک جەعفەری بەرانبەریشمان دەنگی هەراهەرا و گریانی منداڵان دەهات .

چەند کەس لە جیرانەکان کۆوەبووین ویستمان بچین بزانین چیە کەچی لەپڕ دەرکەی ماڵی کاک جەعفەر کراوە و مەحسوومە خاتوونی خێزانی بەسەروسەکوتێکی ئالۆز وبە گریان و لەخۆدان هاتەدەر ولە نێوەڕاستی کۆڵانەکە خۆی بە عەرزدادا .

کاک جەعفەریش دارێک بە دەستەوە ، یەخەی کراس ئاوەلە ،ئارەقگیردڕاو هاتەدەر، کچ وکوڕەکەشی بەگریان بە دوواياندا .

هەرچۆنێک بوو بە چەند ژن مەحسوومەخاتوونیان بردە ماڵی ئێمە وئێمەش بەچەند کەسان دارەکەمان لە چەنگ کاک جەعفەر دەرهێنا وبردمانەوە ژوور . لە حەسارەکە بەڕەیەک راخرابوو لەسەروی دامانینا . کاک جەعفەر چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون و دەستی دەلەرزی قەراغ لێوەکانی کەفێکی سپی یان دەردابوو ئێمەشکە زانیمان توورەیە جارێ هیچمان نەگوت پاش ماوەیەک مام قەرەنی کە ئەویش هەربە هاوارەوە ، هاتبوو پیاوێکی دەنێوەوەچوو بوو .

کەواکەی وەسەر پانتۆڵەکەی ، خستبوو کڵاوێکی میلی سپیشی لەسەر نابوو لاجانگی بەدەرەوە بوون کوتی :

کاک جەعفەر هەستەبابم پچۆ کەمێک ئاو بە چڕوچاوتدا بکە دەهەستە دەی !

ئێمەش بەدووکەسان چووین یارمەتی کاک جەعفەر بدەین، کەچی بۆخۆی هەستاو چۆوە بەر شێرەکە بڕێکی ئاو بە دموچاویدا کردو دوو دوگمە بە کراسەکەیەوە مابوو دایخستن ودەستێکی بە سەروپۆتەڵاکیدا هێناو هاتەوە جێگاکەی خۆی دانیشت .دیاربوو زۆرداخ لە دڵ بوو بێ ئەوەی کە لێی بپرسین دەستی کرد بە قسە و گوتی :

---

ئەگەر هیچتان نەزانن ئەو کاک قادرە دەزانێ ئەوەتا بەرانبەرتان دانیشتووە هەفتەیەک دەبێ و نابێ لەگەڵ خێزانی ئەو کراسیان کڕیوە کەچی ئەمشەویش بەزمی پێ گرتووم کراسم دەوێ .

ئەمنیش لەپێشدا لەسەرەخۆ گوێم دایە وگوتم:

باشە بایی چەندە؟ ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی :

**ـ هەرزانە**

باشە هەرزان یا گران قیمەتی چەندە؟

دووقامکی هەڵێنا وپێشانی دام

ـ دووچەند دووسەد یا دوو هەزار؟

**ـ جائەلعان کراسی دووسەد تمەنی هەیە؟یان خۆت شێت کردووە وادەڵێی ؟دووهەزار تمەن .**

ـ ئاخە تازەت کراس نەکڕیوە!؟

**ـ ئاخرئەوە کراسی نێومالە وهەر بۆکاروبار دەبێ ئەوە یەک ،یەکەودوای ئەوەش فەرق دەکا ئەوجێگایەی کە دەچم خۆهەموو جێگایەک وهەموو مەجلیسێک بۆوەی نابێ شتی هەرزانی بۆلەبەرکەی .**

ـ بۆبرێک بیوناکەیەوە خۆئەمن لەسەر کووپەی ژێر دانەنیشتووم لە خانووی کرێ داین دوومنداڵان دەنێوینە مەدرەسە پووڵی ئاو و بەرق وتەلەفوون دەدەم .

لێرەدا کاک جەعفەر هەستا سەرچۆکان وگوتی :

جائەوە وەبیرم هاتەوە پارەکەدەمانەویست خانوو بگرین دەیگوت هەر جێگەیەک بگری تەلەیفوونی نەبێ نایەم وپێی تێ نانێم .ئەوەرۆژتاکوو ئێوارە تەلەیفوونی بەدەستەوەو .ئەوەماڵی کچی پوورمە ئەوە ماڵی رەفیقەکەمە . ئەوە کوێیە وئەوە کوێیە.

ئاخە بەخاتری خودا دەرەقەت نایەم. سەرتان نەیەشێنم نەیهێنا ونەیبرد بەمنی گوت:

**ـ ئەگەر حاڵت وایەوژنت پێ بەخێونا کرێ ژنت بۆدێنا ؟**

ـ ژنم پێ بەخێو دەکرێ ئەتۆم پێ بەخێونا کرێ کە وەدوای داب ومۆدی رۆژ دەکەوی دەڵێی داخوا کچی کێی یا ژنی کێی ؟

**ـ هەمووکەس دایک و بابی من دەناسێ ئەوە ئەتۆی کەس نازانێ کێی سواڵکەر!**

کەوای گوت زۆرم رق هەستا ئەو رادیۆیەم کە بەدەستەوە بووپێمدادا .ئەویش وەدیوار کەوت .مام قەرەنیش گوتی ئەوەش زەرەرێک کاک جەعفەر چاوێکی لە مام قەرەنی کردووئاوای درێژە بە قسەکانی دا .لەدوایەش چووم دەستمدا ئەوداره ودارێکم لێ راکێشا ئاوای زیقاندو غاری دا دەرو ئابڕووی بردم.

خۆئەگەر لەبەر ئەودوو منداڵە نەبائەو موویە لە پیلاوان نەهاتبایە کە هیچ لە سبەینێ زووتر نەبوو تەڵاقم دەدا وخۆم ئاسوودە دەکرد. خۆ تازە ئابڕووم هەر چووە.

مام قەرەنی گوتی،براکەم برێک لەسەرە خۆبە ،ژن خۆ کراس وکەوانیە هەموو رۆژێک بیگۆڕی .

کاک جەعفەر گوتی: خۆراستە دەکەی بەڵام ئەو ژنە قسە دەقسان دەکەوێ دەڵێ ئەگەر ناتوانی بەخێوم کەی تەڵاقم دە

مام قەرەنی گوتی باشە براکەم ئەدی ئەتۆ بۆلێی دەدەی دەستێک خێرو دەستێک شەر.ئەوە هاتوجێگا یەکەت شکاند یا خودای نەکەردە کوشتت بە قەولی دەڵێن رقێک ماڵ ئاوەدانکەرەو رقێکیش ماڵ وێرانکەرە .

برێک لەسەرەخۆوهێدی بە .

کاک جەعفەرگوتی ئاخە مام قەرەنی گیلان بە قوربانی چاوەکانت بم قسە بیست و چوارەودووی بەکارە .ئەمن بەدایمی خودای لە رێگا و بانانم .رووحم لەسەربەری دەستمە خودا دەزانێ هەر جارێکی کە دەرۆم دەگەڕێمەوە یا ناگەڕێمەوە .خۆهەمووتان دەزانن کە ئەمن جوملەی ساڵێکە لەو گەرەکەم ئەو دەستە لیباسەم لەبەردایە .

جاروبارەش کە دەچمە قاوەخانە وقەننەیەک دەکێشم یا چایەک دەخۆمەوە نارەحەتم. چون

لەوجوورە پیاوانە نیم بەبێ ماڵ ومنداڵم لە دەرەوە بە کەیفی خۆم بکەم وبخۆم. دڵم ناحەسێتەوە. کەچی ئەویش ئاوا لە من دەکا، ناوێری بڵێی پشتی چاوت برۆیە. هەر لە ئەوەڵەوە خەتای خۆم بوو دەڵێن ئەگەر مریشک بۆخۆی خۆڵ وەسەر خۆی نەکا بەکەس خۆڵی وەسەر ناکرێ.

گوتم ئەتۆش بە جوانی پێی بڵێ وتووڕە مەبە دانیشە بە قسە حاڵی بکە مار بە قسەی خۆش لە کون دێتەدەرەوە.

لە جوابمدا کاک جەعفەر گوتی ئەو ئەوجۆرە شتانە نازانێ، ئەگەر پارچەیەک یا کووتاڵێکی تازەی دی هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوە. ئیتر ناڵێ بەشکە جیرانەکەم یا یەکێکی دیکە هەیبێ و بتوانێ زوو زوو بکڕێ ودەبەر کا ئەدی بۆدەبێ ئەمن چاو لەوان بکەم.

چاولێکەری زۆر کەسی کلۆڵ وماڵ وێران کردووە ئەو دەبێ چاو لە گیرفانی من کاو لە قەدەر بەرەی خۆی لاق راکێشێ.

کاک رەحمانی جیرانی دیوار بە دیواری ماڵی کاک جەعفەریش کە برێکیش لەگەڵ ژنەکەی بە خزمەدەردە-چوو وهەر ئەویش ئەوخانووەی بۆدیتبوونەوە بە خۆی وبە ورگی زەلامی، دوگمەی ئاوالەی، کراس ودوخێنی بەدیارەوەی، دەستێکی برد، پشت ملی خوراند وچاوێکی برێک بۆقووچاند و بەکاوەخۆ گوتی:

ئەتۆ راست دەکەی جەعفەر گیان بەڵام دەڵێی چی؟ هێندەی لەگەڵ مەلێ زۆریشی جواب مەدەوە.

کاک جەعفەر گوتی: جائەوە جوابم نەداوەتەوە ئاوای لێکردم وئەوهاتوهاوارەی بۆ

سازکردم.

کاک رەحمان گوتی:

خۆهەموو جارێ وای لێنایە کەم کەم چاک دەبێ. بەشکەم هێندە ئەو کراس وکەوایەشت پێ نەکرێ ئەویش ئەولیباسەی ئێستا ژنان لەبەری دەکەن شەش قەدی کەیەوە ئەودیوی تێدادیارە.

لێرەدا بزەیەکمان بە قسەکەی هات ومام هەمزەش گوتی:

جا ئەتۆ تازە پیربووی بۆوات سەرنج داوەکە پاش شەش قەدان ئەودیوی تێدا دیارە؟

کاک رەحمان گوتی: ئەمن بڵێم ونەڵێم هەروایە بەشی ئەوەندەش هەر دەزانم ودەبینم

کاک جەعفەر برێکی حێ خۆش کردووگوتی:

ئەوژنەی ئەمن هەمەودەیناسم قەت ئەو داب ومۆدەی دانانێ هەر پارچەیەک بێ هەوەڵ کەس دەبێ بیکڕێ ولەبەری کا. سەد جارم پێ گوتووەوەختی وا کە پارچەیەکی تازەدێ برێک راوەستە جالە پاشان بیکڕە لە هەوەڵەوە گرانە بەسەری ئێوە جوابیشم ناداتەوە زوو دەیکڕێ کەچی پاشی چەند رۆژان تمەنی تمەنێک قیمەتی دێتەخوار. یا بەرگەی جارێک شوتن ناگرێ ولەوێ فڕێ یان دەدا. ئاخر خۆمنیش ئەوە و

پوولەم نەدیتۆتەوە زەحمەتی پێوەدەکێشم وئارەقەی بۆ دەڕێژم.ئەوەتا چوار ساڵە پارچە زەوی یەکم هەیە نەمتوانیوە دوودیوی تێدا سازبکەم ولەکرێگرتەیی بحەسێمەوە لەبەر کراس و کەوای ئەوژنەی نەمتوانیوە.

کچ وکورەکەی کاک جەعفەریشکە نێویان کاوە وکەژاڵ بوو لەسەر پلیکانەکان دانیشتبوون وچاویان لە بابیان بریبوو.بەڵام هەر دووکیان لە پێشدا زۆرگریابوون وچاوەکانیان سوور هەڵگەڕابووەوخەویشیان دەهات.

منیش گوتم رۆڵە هەستن پچن بنوون درەنگە سەعات چارەگێکی دەوێ بۆدوازدە.

بابیشیان گوتی:

راست دەکا هەستن ئەنگۆ بنوون.

ئەوان هەستان بچنە ژوورێ دەنگە دەنگی ژنان لە کۆڵان پەیدابوو ئەمن زوو چووم سەرم بەدەرکە داگرت دیتم ئەوە خێزانی کاک جەعفەرە بە تۆبزی خۆی لە چەنگ ژنان رادەپسکێنێ ودەیەوێ بڕوا.

ئەویش بەبێ چارشێو بە لینگی تەق تەقیلەی. من و کاک قادریش چووین پێشمان پێ گرت گوتمان ئەوە چیە خۆئەنگۆ منداڵ نین! وەرە بچۆوە ژوور لەگەڵ ماڵ و مێردی خۆت دانیشە .کەچی لە جوابدا گوتی:

تازە قەدەمم وەو ماڵەی ناکەوێتەوە. دەبێ هەر تەڵاقمدا.

منداڵەکانیش لەبەر دەرکە راوەستابوون ودەگریان.

گوتم "ئەدی منداڵەکانت

گوتی: منداڵم بۆچیە؟ تازە گەورە بوون ئەوانیش بابۆ ئەوبن .ئیدی پێت وایە ئەوان لە بابیان چاتردەبن و گومبەزم لەسەر دەکەن؟

زۆرمان پێ گوت ولەبەریدا شلوکوت بووین "دایکت چاک بابت چاک ،وەرە بگەڕێوە درەنگە مەڕۆ.:

گوتی:نا ماڵی بابم نیزیکە گوتم لە کوێ نیزیکە.لەوسەری شارن.

گوتی دەی جا چیە خۆگورگ نامخوا .رێی داگرت ورۆیی.

دیسان ئەمن چووم پێشم پێ گرت وگوتم:

بێ وەختە وەرە سەرو ئەگەر هەر ناچی یەوە ماڵی خۆت ئەمشەو بچۆماڵی یەکێک لە جیرانەکان تا سبەینێ بزانین چۆن دەبێ ،بادایک و بابت نەزانن وئەوان نارەحەت نەبن .تەماشام کرد هیچ فایدەی نیە ،هەردووک لاقی دەکەوشێکی ناوە ودەڵێ: هەر دەڕۆم! جاکەوابوو هاوارم کردە خێزانم وگوتم: جووتێک کەوش وچارشێوێکی بۆبێنن بائاوا بە شەقام وکۆڵانانەدا نەڕوا.

وەڵا کەوش وچارشێویان بۆ هێنا وکەوشەکەی دەبەرکردو چارشێوەکەشی پێدادا، ئەوە هەر پێشی دەڵێین و جوابمان ناداتەوە. ئێمەش ژن وپیاوێکمان لەگەڵ نارد.

گەڕاینەوە چووینە لای کاک جەعفەر.گوتی:

خۆبۆخۆتان ئاگاو لێ بوو چەند بەدفەڕو لاسارە.جوابی خۆی نەبێ جوابی کەس ناداتەوە.

منیش حاڵیم کردلەبەر منداڵەکان بڕێک تاقەت بێنێ وسەبری بێ.هەستاین خودا حافیزیمان کردووهەرکەسە چووینەوە ماڵی خۆمان.

ئەگەر چوومەوە ژوورێ سەعات یەکی نیوەشەو بوو. خێزانم بە گاڵتە پێی گوتم کە زۆرتریش بەراستی بوو ئاگاتلێیە من بۆتۆ چۆنم قەتدڵم نایە بەزمی شتیوات پێ بگرم .لەسەر کراسێک وا بقیژێنم وئابڕووت بەرم؟ ئەگەر ساڵێ جارێکیش بۆم نەکڕی هیچ ناڵێم.

منیش هیچم نەگوت بەڵام لە دڵی خۆمدا دەمگوت خۆ راست دەکەی وای،قامکی دەستان هەموو وەک یەک ناچن. وهەموو ژنێکیش وانیە .

# ئێوە و ئێمە

سنە : کاک ش .ع

بە بروای ئێمە اورمیە یا ارومیّە کە بە شێوەی ئاسایی بەبێ بۆروشەددە وەک "ارومیە" دەنووسرێ هەردوو - کیان دروستن

**"ئوور"** یا **"ئوروو"** لە زمانی ئاشوریدا بەمانای **"شار" ە** ، وەک لەوشەی **"ئوورشەلیم"** و **"ئووربیل"** (**ئەربیل** ،**هەولێر**)**- یشدا** هەیە. **"میە"** لەئاشوریدا بەمانای **"ئاو" ە** ، کەوابوو **" ئوورمیە "** یا **" ئوروومیە "** یانی **" شاری ئاو "**

سەددی شەهید **کازمی: کاک محەممەدی حەبیبی**

ئێمەش هیواداریـن هیچ نووسەر و موحەققیقێکی کورد بەرهەمەکانی خۆی لە خەڵک نەشارێتەوە .

**شنۆ :کاک غەفووری سەلیمی**

رەخنەکانت بەجێ نەبوون ، سروە جگە لە شنەبا چ مانا - یەکی دیکەی هەیە؟ئەگەر پێت شک دێ دەتوانی بۆمان بنووسی ،یا ئەگەر ناوێکی دیکەت جگە لە سروە بەدڵە بۆمان بنووسە ،سپاست دەکەین .

**پیرانشار : کاک رەحیمی ئەحمەدی**

دیاریەکەتمان پێگەیشت بەداخەوە لەباری شیعریەوەزۆر کەم هێزە ،چاوەڕوانی هاوکاری پتری ئێوەی خۆشەویستین.

تاران :**کاک محەممەدی قەهوەیی**

.. شیعری ئەمجارەت جوانتر بوو ، بەڵام لە باری کێشەوە تەواونەبوو . ئەگەر ئەو هەستەت بە پەخشانێک دەربڕیبا کەلکمان لێ وەردەگرت چاوەڕوانی هاوکاری زیاتروئاواتە خوازی سەرکەوتنی پتری ئێوەین .

بۆکان :**کاک ح .شیوەن**

سووژەی شیعرەکەت جوانە بەڵام لەسەنعەتی شیعر شارەزانی . پتر موتاڵابکە ودرێژە بەم هونەرە بدە .

سەقز :**کاک رەزاوەفا دووست**

باشترین رێگا بۆ فێرا بوونی زمانی کوردی - خوێندنەوەی زیاتری گۆوار و کتێبە بەنرخەکوردییەکانە . زەوقی شاعیریشت هەیە . هیوا دارین درێژەی پێ بدەی . دوو شیعری یەکەم :

**ئەورۆ براز ستانە**<br>
**بەفران لەسەرکوێستانە**<br>
**لەسەر دەشت ولەکێوان**<br>
**نیشتووە سەرمای زستان**

جوانن ، بەڵام لەشیعرەکانی دیکەتدا لەبارێکێشەوە کەم و کووڕی دەبینرێ .

شیراز :**کاک ج ق مالە**

نێوەرۆکی نووسراوەکەت جوانە و هەستی شاعیرانەی تێدایە . بەڵام نەلەسەر کێشی کۆنەو نەلەسەر کێشی خۆماڵی . شیعری نوێش دەبێ کێشی هەبێ .

مەهاباد :**کاک ج.م .شەمزاو**

پێت وانەبێ شیعر هەر چەند درێژتر بێ چاترە لەم دوو دێرە کورتەدا هەست و هونەری شاعیری بە جوانی دەردەکەوێ

**کاتێک هاتی دالێ بەزین**<br>
**زاڵ بوو لەسەر کۆترێئەوین**<br>
**کەم کەم دەچوو قەڵاتی ژین**<br>
**بەرەو رووخان بەرەوجمین**

شیعرەکانی دیکەشت لە باری کێشەوە زۆر ناتەواون. بۆوینە وشەی"نەورۆزی لەم شیعرەدا جێی نابێتەوە :

**تەزووی ساردی شەوی زستان**<br>
**هەواڵی نەورۆزی شادی**<br>
**هەواڵی وەرزی پشکووتن**<br>
**هەواڵی رۆژی ئازادی**

مەهاباد :**کاک حەمیدی نەزیمی**

وێڕای سپاس ،نووسینەکەت زۆر جوان و پاراوە .بەڵام لەسەر شیعر دەبێ پتر کار بکەی .

# ئەدەبی

گوندی رەحیمخانی بۆکان:
**کاک یونسی مام رۆستەمی**

زەوقی شیعرت هەیە .تەنیا لە جێگایەکدا رەدیف و قافیەت لێ تێک چووە . لە "چۆن بوو" و "کێ بوو" دا وشەی "بوو" رەدیفە و "چۆن" و "کێ" قافیە نین .جگەلەوە چونکوو شیعرێکی زۆر بەسروە هەڵگوتراوە نەمانتوانی چاپی بکەین . چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەی ئێوەین .

سەقز :**کاک چالاک**

کوردی نووسینەکەت زۆر جوانە .شیعرونووسراوەی کوردیمان بۆ بنێرە و پەیوەندیمان لە گەڵ ببستە .

بەنگیجەی سەقز :**کاک محەممەد شیوەن**

شیعرەکانت ئیحساسی ئینسانی جوانی تێدایە .بەڵام کەمو کووڕیشی زۆرە.هیوادارین بە خوێندنەوەی زیاتر لەم رێگایەدا سەرکەوی .

سەقز :**کاک سەدیقی عەزیزی :**

لە هەڵبژاردنی سووژە بۆ شیعردا سەلیقەت هەیە . بەڵام بەداخەوە هێشتا بۆت ناخرێتە چوار چێوەی شیعرەوە پتر تێبکۆشە و زیاتر بخوێنەوە .

بۆکان : **کاک سەید عبدالرحمانی عەزیزی**

بۆ لەچاپدانی کتێبەکەت لە پێشدا نوسخەیەکمان بۆبنێرە تادەستەی نووسەران رای خۆی لەسەربدا . دوای پەسندکران کاروباری سەربەچاپی کتێبەکە بەستۆ دەگرین .

سنە : **کاک جەلیلی پوورشاد**

زەوقی شاعیرانەمان لە شیعرەکانتدا بەدی کرد ئەرکی تۆلەم پلەدا زیاترخوێندنەوە وسووژەی جوان هەڵبژاردنە .

مەهاباد: **خوشکە مەعسوومە ع .**

ئەوە چەند دێڕلەشیعرەکەت چاپکرا . بەلام تکادەکەین تۆبەوئیستعدادەوە پترخۆت ماندوو بکە .

سروەهاتووە بەبای شەماڵ
هێنای پەیام بۆ کوڕ وکاڵ
بەیان ئەنگووت وغەم رابرد
هاتەوەدی ئارەزووی کورد
سروە قسەت چەندە خۆشە
دڵی کوردت بۆ پەرۆشە

ئیسکی بەغدای بۆکان :
**کاک رەشیدی حەبیبی فەر**

جگە لە یەکەم دێڕی شیعرەکەت کەدەڵێ :
"ئەی خەم لەسەراپەردەی دڵ
بچۆوە بەدەر "
باقی تێکەڵ پێکەڵ بوو پتر حەول بدە .

مەهاباد: **کاک سەلاحی ـ ق**

ئەم شیعرەشیعری وەفایی شاعیری بەناوبانگی کوردە و سەر وتاکەی ئاوادەست پێدەکا

گادە سووتێم گادەگریەم غەرقی ئاوو ئاورم
ئاخ لەبەربەختی سیانازانم ئەزبۆچ نامرم

مەهاباد: **خوشکە وەحیدە جەبیدی**

شیعرەکانت کەم وکووڕی هەبوو وبڕوای ئێمە ئەگەر هێندێک لە بارەی وەزنەوە خۆماندووبکەی دەتوانی شیعری جوان بڵێی چاوەڕوانی شیعری تازەی ئێوەین .

مەهاباد: **کاک عەزیزی عەزیز نژاد**

جیاوازی زمان ولەهجە ئەوەیە کە زبان لە چەند لەهجە وبن لەهجە پێک هاتووە ئەگەر سەیری زمانی کوردیت کردبێ خۆی لەچەند لەهجەوەک شیمالی ونێوەندی وجنووبی پێک هاتووە کە ئەوانیش بۆخویان چەند بن لەهجەیان هەیە . جاکەوابوو کوردی زمانە ولەهجەنیە

**وێرای سپاس لە کاک سەید موحەممەدی سەمەدی کە ئەم سەرگوریشتەی بۆ ناردووین**

ئەمن ناوم کەریمە ناوی خانەوادەگیم هەونەرمەندە، ولە شیعر و وێژەوانیدا مەشهوورم بە فیدائی لە سالی هەزارو سێسەدو حەوتی (١٣٠٧) هەتاوی لە گوندی "**سی سێرێ** "کەیەکێکە لە گوندەکانی **گەورکی سەردەشت** لە بەکێک لە بنەماڵەکانی وەرزێریدا پێم ناوەتە ئەم جیهانە پان و بەرینەوە.

بابم ناوی "**سمایلە** "ولە رەچەورەگەزی تایفەی "**بامەرەیە** "کەقەومێکن هەرلە کۆنەوە هەتا ئەورۆلەو گوندی سی سێرێدا نیشتەجێ بوون و ئەورۆ کەش بنەماڵە ـ یەکی زۆر لەو دێیەدادەژین وماون. دایکم ناوی"**ئامان**" کە نەژادی وی وەکوو بیستوومە دەچێتەوە سەر رەگەزەی کوردی **جاف**. لەکاتێدا کەتەمەنی مندالی من دەگاتە سی مانگی بابم لە خاوەن مولکی گوندی سی سێری دڵی نارەحەت دەبی وبە پێ ی رێ وشوێنی ئەو سەردەمە لە دێی سی سێری دەگوێزێتەوە و دەچێتە گوندی "**کانی رەشی**"کە یەکێک لە گوندەکانی گەورکی مەهابادە.

ئەمن لەو گوندەدا گەورەبووم و دەوری منداڵیم بەسەر بردووە. بابم هەر چەند بێ سەواد ونەخوێندەوار بوو زۆر عیشق و عەلاقەی بەخوێندن وزانست هەبوو وبە جورێکیوا پابەندی عیلم وزانست بوو کە تەواوی کتێبە وردیلەکانی وەکوو: **سمایل نامە ـ ناگەهان جورم بەخش ـ عەقیدە ـ مەهدی نامەی** لەبەر بوون و دەیزانین. جاهەر بەو بۆنەوە لە تەمەنی حەوت سالیدا ئەمنی نایەبەر خوێندن و دەستم کرد بەسی پارە و خوێندنی قورعانێ، لە لای ماموستای ئاوەدانی کە ناوی "**محەممەد**"بوو ولە گەڵ بابیشم خزم بوو. هێشتا قورعانم بەسێ یەک نەکرد بوو کە دووبارە بابم لە لایەن خاوەن مولک دڵهێشکراو لە دێ ی کانی رەشێ کۆچی کرد چووینە گوندی "**وەرگێل**"کە ئەویش دێیەکە لەگوندەکانی گەورکی سەردەشت و لەوێدا نیشتە جێ بوین و لەخزمەت

ماموستای ئەم گوندە کە بە "مەلاعەبدوللای خەندانی" مەشهوور بوو قورعانم تەواو کردو کتێبەکانی وەکوو: **جورم بەخش - ناگەهان - سمایلنامە عەقیدە - وبابی ئەوەڵ لە گولستانی شیخی سەعدیم** لە خزمەت ئەو ماموستا یەدا خوێند. لەپاشی دووساڵ مانەوە لە گوندی وەزگیلەدا ئەمجاریش مالیکی ئەو گوندە دڵی بابمی زورئێشاندو سەد برو بیانووی لێگرت و بابم ناچاربوو لە پاش چەند ساڵ دووری و دەربەدەری لە خاکی باب و باپیری خۆی بگەرێتەوە بۆ ناو خزمەکانی جائەوە بوو کەهەر لەوەرگیلی باری کرد چووە نێو گوندی سی سیری وهەتاکاتی مردن لە وێمایەوە. ئەمنیش لە سی سیری لە حوجرەی فەقییان کە مودەرریسی ئەو حوجرە ماموستا سەیید حوسین حوسینی بوو دەستم کرد بە دەرس خوێندن و کتێبی گولستانی سەعدی لە فارسی داخویند و تەواوم کرد لە پاش ئەوە دەستم کرد بە دەرسی عیلمی عەرەبی و کتێبی "**تەسریفی زەنجانی**" - "**عەوامیل**" و "**ئەنموزەج**"م خوێند. وێستا کتێبی "ئەنموزەج"م تەواو نەکرد بوو کە بابم، تەنیا هومێدی گەورەی من لە ژیانمدا، چاوی لە دنیاپۆشی ومرد و ئەمن ودایکم وبرایک (قادر) وخوشکێک (ئایشی) بێ سەرپەرست ماینەوە.

برایەکی لەخوم گەورەتر هەبوو بەناوی "**رەسوول**"کە دایکمان جوی بوو، بینا بە وەسیەتی بابم ئەوبوو بە سەرپەرستی ئێمە، چوون بابم وەسیتی کرد بوو کە دەبێ کەریم هەربخوێنی ونابی دەس لە خوێندن هەلبگری، خودا هەلنا گری رەسوولی برام ئەوەندەی کەبۆی کرا لە خزمەت کردن بەمن و ئەوانی دیکە کۆتایی نەکردوئەمنیش لەسەر ئەوهەموو دەردی سەری وفەقیری ونەداری یەی کە رووی تێکرد بووین لە خوێندن دەست بەردار نەبووم وبەهەر کویرەوەری یەکی کە بووبی کتێبی **ئیزهار - تەسریفی مەلاعەلی - وەزع و ئیستیعارە جامی** م تەواو خوێندو دەستم کرد بە کتێبی "**سیوتی**" جالەو کاتەدا ئارەزووم دەکرد کە ماوەیکی بۆدەرس خوێندن لە دێی سیسیری بچمە دەرێ. هەربەو بۆنەوە رووم کردە مەملەکەتی بانە و لە گوندی "**سیوچ**" لەلای ماموستا مەلا "برایم" کەمودەرریسی ئەم گوندە بوو دامەزرام و لە هەوەڵی بەهار هەتاهەوەڵی پاییز لەو گوندەدا مامەوە و کتێبی سیوتیم تەواو کرد. لەو ساڵەدابوو کە**حەمەرەشید خان** کە یەکێ بوو لە سەردار عەشیرەتەکانی وڵاتی عێراق، لەبەرابەر هێرشی لەشکری دەوڵەتی ئێرانی دا لەشاری سەقز شکستی خواردو بەرەو شاری بانە گەراوە ولە ئاکامدا تەواوی شاری بانەی سوتاندوئاوری تێ بەرداو بە خۆی ودارودەستە کەیەوە رو یشتنەوە بۆخاکی عێراقێ.

لەوکاتەداخەڵکی دێهاتی بانە لەترسی قشوونی ئێرانی هەموو رەوین و گوندەکانیان چۆل کرد وئەمنیش وەکووخەڵکی دێی سیوچ رەویم وهاتمەوە گوندی سی سیری ولەخزمەت ماموستا مەلاعەبدورەحمانی سی سیری کەلەتایفەی خۆمان بوو وببووە مودەررسی حوجرەی سی سیری دەستم کردبە دەرس خوێندن و کتێبە عیلمەکانم زۆرترلەخزمەتویدا تەواو کردن هەتاگەیشتمە کتێبی - **موختەسەری** ئەوجار لە سی سیرەوە چوومە گوندی **هەنداوە** کە دییەکە لە دێکانی کەلوێی سەردەشت، ماوەیەک لەخزمەت ماموستا مەلاحەسەن حەزینی دامامەوە و لەوێشەوە چوومە شاری سەردەشت بۆخزمەت قازی عەلی وماوەی شەش مانگان لەم شارەمامەوە و لە پاشان بەرەو - **تورجان** کە دێیەکە لە گوندەکانی موکریان وەرێ کەوتم و لە خزمەت ماموستا مەلا "**عەبدوللای موحەممەدی سووتوویی**" لە گوندی ناوبراودا دامەزرام و

کتێبی "**گەلەنبەوی بورهان**"م لە خزمەتدا خوێند، ئەوجار بیستم کە حوجرەی گوندی "**نمەشیر**" کە ئەویش دێیەکە لە گوندەکانی بانە، چۆڵە وفەقێی لێ نەماوە هەرکە ئەو خەبەرەم بیست دەستمدا کتێب و لێفەو بوخچەی خۆم وبەتالووکە بەرەو گوندی نەمەشیروەرێ کەوتم و لەوێ لە خزمەت **ماموستا مەلا ئەحمەد حەیدەری** "دا دامەزرام وئەو کتێبە عیلمانەی کەمابوون وەکوو: **جەمع ولجەوامیع ـ تەشریح ـ ریسالە حیساب و تەهزیب** ـ لە خزمەت ویدا تەواوکرد و لە پاش خوێندنی ئەو کتێبانە ئیجازەی ئیفتا و ئیرشادی دامێ ولەسالی ١٣٣٢ی هەتاوی کارنامەی مەلایەتی بۆ نووسیم وگەڕامەوە بۆ گوندی "**سیسیری**" ولەوێش ڕابوومەلایەتی چوومە گوندی "**نستان**"ی کەدێیەکی نیزیکی سی سیری وماوەی پێنج سالان لەوێ خەریکی پێش نوێژی ودەرس کوتنەوە بەفەقێیان بووم و لەوێشەوە بۆمەلایەتی هاتمە "**کاولانی ـ سەری**" کە یەکێکە لەگوندەکانی گەورکی مەهاباد و ئەلئان ماوەی بیست وهەشت ساڵە لەو دێیە دەژیم و ڕۆژگار بە دەرس کوتنەوە بەفەقێیان تێ دەپەڕێنم . هەرلەو دێیەدا ژنم هێنا و ئێستاچوار کوڕ ودوو کچم هەیە . لەبارەی شێعرەوە دەبێ بڵێم کە لە تەمەنی شازدە ساڵیمەوەشێعرم کوتووەچون عیشق وعەلاقەیەکی زۆرم بە ویژەوویژەوانییەوە هەبووە ئەمڕۆش ئەم عیشقەم هەر هەیە . لەتەمەنی ژیانم دا شیعرێکی زۆرم داناوە هەر چەند لەدەورەی تاغووتدا سێ (٣) هەزار شیعرم لەبەین چوو و شوێنەواریان نەمائە لبەتە زۆرترلە تەمبەڵی وبێ موبالاتی خۆم وایان لێ هات چوون لەیەک دەفتردا کۆم نەکرد بوونەوە وهەمووپەڕپەڕوبڵاوبوون بەشانازییەوە دەڵێم ئەوڕۆکە هەرچی هەمن بە نەزم وتەرتیب لە دەفتران دانووسیومنەوە و ئەوانەی هەر ئێستالەلای خۆم بەرێک وپێکی نووسراون و ئامادەن بریتین لە :

**١) دیوانی شێعری کوردی**

**٢) دیوانی شێعری فارسی**

٣) **لاس وخەزاڵ لەسێ (٣) دەفتەردا کە جەمعەن چوار هەزار وحەوسەت شێعرە .**

٤) **نامیلکەی مێژوی ژیانی فیدائی . سەرگوزەشتەی خۆمە لە منداڵیەوە تائەوڕۆکە تاریخی کۆمەڵایەتی وڵاتەکەمانی بەتەواوی تێدا هاتوە جەمعەن نیزیکەی هەزارشیعرە .**

ئێستاش ئەگەر خوداتەوفیقم بدا و عومروەفابکاوبارگرانی ژیان وکەندوکۆسپ لێم گەڕێن خەیالم وایەکە بەیت وباوی **دمدم** ـ بەشێعردانێم ولەو بارەوە خزمەتێکی ناچیز و نالایق بە هۆز و گەلەکەم ئەوەبوو کورتەیەک لە بەسەرهاتی پڕلە مەینەتی **کەریمی فیدائی** .

کوردستان ئیرۆ خەمگینە پر شین
هاتی هەواری یا گەلەک دلتەزین
دلێ نیشتمان گشت بوو یە برین
کورد و کوردستان تەڤ دکەن گرین
گولیێد گولزارێ ژینێ قشرین
کولیکێ چیا حەموو پەژمرین

* * * *

چیا ییێد وارێ مەتەڤ مژوتەمە
قاز و قومری، کەو تیێدا بیێدەمە
ئاڤیێد زۆزانا هەر مەند و لەمە
دلێ خەلقێ مە برین و خەمە
هێسر دخوشن هەر وەکە چەمە
ل چاڤێ گەلێ ژار و جگەرخین
بۆ هۆزا نڤانێ جان و دلحەبین

* * * *

باشوور و باکوور هەر ژێر و ژۆران
کورمانج و زازا گەل گشتی سۆران
قۆچان، بادینان، حەتانی گۆران
فەیلی و لەکی کەلهور و لۆران
تەواوی کوردی سەرچەرخا دۆران
حەموو رەش و هەشنچاڤ ب هێسرین
ب سەد فەغان و ئاخین و نالین

* * * *

حەموو کورد زمان ئیرو رەش پۆشن
درد و کول مشە، گەلەک و بۆشن
ل دەردێ هۆستا زامدار نەخۆشن
بەحرا رۆندیکاتە ژی لە کۆشن
بۆ ڤەمرینا چرایا رۆشن
خەمبار و خەمدار، خەمیار و خەمگین
پیکڤەد بیژن شینە، شینە، شین

* * * *

ئەو کوردی زۆرپاک میرخاسێ میرچاک
ژ قالب فرِی رووحێ وییێ پاک
هەیڤا عەسمانێ شەڤیێد سامناک
گەش و شەو قاویژ گەلەکی رووناک
رژییا ژۆرداهات ئاخ کەتە ژیرخاک
هەیڤا چلڤلین کەتە ژیر زەمین
پر کا رووح چوو دونیا یا ژۆرین

* * * *

هال هال ژ خەما گران دلبداخ
سۆسن ب ئەزمان د بیژە سەد ئاخ
کولیلک کەسەرێ دکیشە ژ ناخ
پیسیر درِاندن حەموو گولیێن باخ
چلمسین وەرین گشتی شاخ بە شاخ
گولە روون بەیبوون حەموو پەژمرین
هێسر ل چاڤێ نیرگزێ وەرین

* * * *

"جەرگی مێلاقە لە داخا رەش بوون
ئەشکی شللیرە وەرین وگەش بوون
بنەوش ئوستوخا رسەرلەسەرلەش بوون
سور گول وئاسمین دل ورەش وهەش بوون
دلی "هیرۆیا" بەرئیشێ قەش بوون
کراس درِاندن رووەمەت هەلدرین
کوما سونبولا کەزکێ خوەبرین

* * * *

ل شەڤا نۆزدێ هەیڤا ئادارێ
یەکمین مەها دانێ بەهارێ
ل سالا تاڤی بڤێ هەژمارێ
سیسەد، شیشت وپیێنج سەرهەزارێ
د ئورمییێ داتاڤکە تە خارێ
شەمالکا ژینێ کرە ڤەمرین
روحێ پاک مەشی و بۆخولدا بەرین

* * * *

تاریک وروون بوو نەینووکا ژینێ
نالەی جودایی ل سەرهەژینێ
توحفا موزە فەرل رینووسینێ
هەوارِی خالی وارگەی ئەڤینێ
گەل "پاشەروک "ا ژین وڤەژینێ
ئەڤ دەستکرانە ژهۆستادمین
گەلەک گوڤار ژی وی کری نەقشین

* * * *

* *

دوای دەساڵ کەچاوم بە "سۆران " کەوتەوە واقم ورما .ئەوشۆڕەلاوەی جاران نەبوو . پەیکەرەی خەم و پەژارەبوو . ردێنی بۆزو سەری ئالۆز وچاوی بێ سوێ و جل وبەرگی ژاکاوی هاواری دەکرد کەلەوماوەیەدا چ رۆژگارێکی رەشی رابواردووەو چەندەی بەدبەختی دیوە تێک شکابوو . شەمزابووهاڕدرابوو لە پێشدا نەمناسی یەوە کەلێی خورد بوومەوە و ناسیمەوە بەخۆم نەبوو فرمێسکم لەچاوان گەڕاوهەرام هات:

ـ هیواگیان ! خۆزگە زووتر دەمدیتی :

ئەمجار بەئەسپایی لەبەرە خۆیەوە گوتی :

ـ باش بوو چاوم پێت کەوت جاچش بابمرم ...

بەزەییم پێداهات . گوتم :

ـ سۆران !

ـ دەزانم دەڵێی چی ؟ دەڵێی بۆوام لێ هاتووە ؟ ئاخ .... هیوا ژیان گێژاوێکی سامناکە ...هەر بینا ئەوگێژاوە نەرمی بێ گیانمی بەرەوبەستێنی پیاو ، پڕلەزەوق،لێوان لە هیوا ، سەرڕێژ لەهەستی جوان وناسک، هەرکە دەرفەتی دەبوو تارەکەی دەستدەدایە وبە دەنگی خۆش کەلە دڵی پڕ جۆشیەوە هەڵدەقوڵی و لەدڵان دەنیشت تێی هەڵدەکرد .

ئەزموونی ساڵی ئاخری زانستگامان داوخۆمان ساز کرد کەبگەڕێینەوە وەڵاتی خۆمان پێشنیاری پێ کردم چەند رۆژێک بچمەشاروگوندی ئەوان وبەیەکەوەرابیوێرین منیش قبوولم کرد .

گوندەکەیان لە داوێنی

# تەنیای تەنیا ....

هاوار

کرد :

ـ سۆران !

بەئارامی رووی تێ کردم و بزەیەکی ساردی هاتەسەر لێوو بەدەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامی دامەوە :

ـ هیوا ! ئەوە ئەتۆی ؟ چەند ساڵە چاوەڕوانتم ...

دەنگی دەتگوت لەناخی چاڵاوێکی قووڵەوەدێ .خەمی لێ دەباری.یەکترمان لەئامێز گرت وئەسرینمان هاتەخوار. دەیان پرسیارم لەمێشکدا بوو نەمدەزانی چی لێ بپرسم؟ تاوێک بێدەنگ بووین هەر چۆنێک بوو " سۆران "وەقسە نەبوون رامالی ...هەست دەکەم وەک پەڕێک دیلی گێژە لووکەی نەهاتیم ... مان و نەمان بۆمن‌یەکسانە ...جێی قسە نەبوو . قەرارمان داناشەوبچمەلای.ناونیشانی ماڵەخۆی پێ دام ولەیەک هەڵبڕاین .

تاشەوهەربیرم لە"سۆران " دەکردەوە .چ بوو وچی لێ هاتبوو...؟بۆ...؟بۆ....؟ " هەزاران "بۆ؟" مێشکیان دەسمیم وئازاریان دەدام ... کاتێک بەیەکەوە لەزانستگا دەمانخوێند لاوێک بووسەرو رووخۆش .دەنگ پیاو ورەنگ بەرزەکۆیەک داهەڵکەوتبوو. هەتاچاو هەتەرەی دەکرد دیمەنێکی جوان ودڵڕفێن خۆی دەنواند .باوکی کەمەرداڕێکی بەناوبانگ بووبەماڵ ومنداڵ ودەست وپێوەندە وەچووبوونە هەواران "سۆران "یش چاومڕێی من بوو ئێمەش بەرەوهەوار وەرێ کەوتین .هەتابەرەو پێشتر دەچووین وەڵات بژوێنتر ،مێوگ ونوالە زەنوێرتر ،کانیاوساردتر و ئێمەش سەرخۆشتر دەبووین و هەستی شاعیرانەمان زیاتر بەرەودنیای خەیاڵ دەفڕی .

نزیک نیوەرۆیە گەیشتینە

هەواران لەم لاوئەولاچەند
خێوەت ورەشماڵ هەلدرابوو و
مەرومالاّتێکی زۆر لەبەندەن و
لاپالان دەلەوەڕان.بۆنیخۆشی
مەندۆک وهەلّزوبیزا وگیاخاو
ومۆلەبەران وهەزاران گیا
وگوڵی دیکەبەرامەیەکی
تایبەتی لەهەوادا بلاّوکردبۆوە
دەنگی بلوێری شوانان تێکەلێ
بالەبالی مەڕ و بەرخەل ببوو
بەهەشتێکی بێ وێنەبوو. کە
دابەزین زۆریان حورمەت

بۆدیمەنی جوانت ...
دانیشتین .لەدنیای
خەیالّدا بووین پێمان وانە
بوو کە دنیایەکی دیکەش
هەبێ کەخەمی تێدابێ."سۆران"
تارەکەی لەباوەش گرت و
هەوایەکی خۆشی دەستپێ
کرد . دەنگی لێ هەلّێنا
دەنگی ئاشنای دلاّن بوو ....
چریکەی دەرۆیی بۆ دوور..
دیمەنی جوان ودلّرفێن،دەنگی
خۆش بۆن وبەرامی مەستی

کچی خالّمە .
لەپێش ئەوخێوەتەی کەلێی
دابەزیبووین چەند ژن ویاو
راوەستابوون وقسەیان دەکرد.
میوانەکانمان بەخێرهاتنکرد
و"سۆران "من وئەوانیبەیەکتر
ناساند:
ـ هیوا ،هاوڕێی خۆشەویستم
پیرۆت ئاغاخالّم ...خالّۆژنە
گەوەر... بەهارە ....
شەوەکی دەرفەتیان بۆ
هەلّکەوت تابۆیەکەم جار بە

گرتم وریزیان لێ نام وبەرەو
خێوەتێکی گەورەی سپی
ڕێنوێنی یان کردم . دوای
حەسانەوە ،"سۆران"تارەکەی
دەستدایە ووەبەندەنێ
هەلّگەڕاین .واسەرمەستی
دیمەنی خۆش ودلّرفێنی ئەو
مەلّبەندە ببووین کەنەمزانی
کەی گەیشتینە دوندی کێو
لەترۆپکی چیاوەبەرجەوەندی
ئەوناوچەیەسەدهێندە جوانتر
بوو . لەبەرەخۆمەوەگوتم :
ـ ئاوەدان بی کوردستان

هێن ،گشتیان بۆمن ببوونە
دووبالّ بۆفڕین لەئاسمانی
بێ سنووری خەیالّدا..نزیکەی
بانگی شێوان داگەڕاینەوە.
دوورونزیکی رەشمالاّن بووین
کە "سۆران "سلّێکی کردوگوتی:
ـ میوانمان بۆهاتووە.
مالّەخالّم .بەهارە..بەهارەش
لەگەلّیانە.
ـ بەهارە...؟بەهارەکێیە
"سۆران" چاوێکی پڕ لە
شەرمەزاری لێ کردموگوتی :
ـ چتلێ بشارمەوە؟بەهارە

وتە رازی دلّی خۆیان بەیەک
رابگەیێنن وخۆبۆژیانی
هاوبەشئامادە بکەن .
دوای دووڕۆژ "پیرۆت ئاغا
وخێزانی و"بەهارە "گەڕانەوە
لە دوای ئەوان "سۆران" یەک
پارچەببوو بە شیعر
بەمووسیقا ،بەهەست.دلّنیا
بووم بێجگەلە"بەهارە"بیری
لەهیچ نەدەکردەوە .ئەمنیش
پاش چەندرۆژ هەوارم بەجێ
هێشت .ئەوە ئاخرین دیداری
من و"سۆران " بوو.گەڕامەوە

شاری خومان ودوای چەندمانگ بۆدرێژەدان بەخوێندنم سازبووم بچمە دەرەوەی وەڵات بەنامە ماڵئاواییم لە "سۆران "کرد. یەک دووساڵ نامەمان بۆیەکتردەنارد.لەبیرمەلەنامەیەکدا بۆی نووسیبووم کە "پیرۆت ئاغا" "بەهارەی" بەنابەدڵی بەشوو داوە .لەئاخرین نامەشدا بۆمی نووسیبوو"بەهارە" حاڵی گۆڕاوە...نازانم چۆن بوو کە نامەناردنمان براوە .ئیدی هەواڵێکم لێی نەبوو تائەمرۆ کە دوای دەساڵ دێتمەوە .

شەوکەلێی وەژوور کەوتم زۆری پێ خۆش بوو.ماڵەکەی بۆنی تەنیایی لێ دەهات دوای بەخێرهێنان چایەکی لەپێش دانام وسیغارێکی داگیرساند ومژێکی لێ دا. چاوی لە دووکەڵی سیغارەکەنەدەترووکاند .دەتگوت رابردووی خۆی لەودا دەبینێ ..زۆری پێ نەچووکەوەقسەهات:

– هیوا گیان ! نازانی لەدیتنەوەی تۆچەند شاد بووم .وەک کەسێکی کەلە گیانەڵڵادا بێ بەئاواتی دیدارت بووم پێم ئیلهام کرا دێی . ئاخرین دیدارمان لە هەواربوو ...ئاخ ...هەوار.. هەوارت لەبیرە ؟ لەوڕۆژەوە ژیانم گۆڕدرا .ژیانێکی خۆشم بوو. لەئەوپەڕی خەیاڵدا دەژیام بەڵام بەلەدەس چوونی "بەهارە"ژیان بۆمن بوو بە دەریایەکی بێ بن بەهەزاران شەپۆلی ورد ودرشتەوە. لە دوای "بەهارە" وەک تەختە شکاوێکی سەرگەردانم .بێ ئەوەی کەبۆخۆم بمەوێ دیل وکۆیلەی شەپۆلانم شەپۆلی نەهاتی شەپۆلی خەم ،شەپۆلی شەمزان ..ئارەزوومگەیشتن بە بەستێنە ...بەڵام بەستین هەر لێم دوور ودوورتردەبێتەوە پێم وایە بەستێن بەهەشتی ئاواتمە ودڵخوازم لە وێ وەدی دێ . درەنگ یازووپێی دەگەم .بەڵێ هیچ ئاواتێکم نیە مەرگ نەبێ ...

سەرم سوڕما بوو"سۆران" بۆ وای لێ هاتبوو؟ بەراستی نیگەرانی بووم . قسەکانی بۆنی مەرگی لێ دەهات تاوێک بێ دەنگ بوو. قومێکی لەسیغارەکەی داودرێژەی پێدا

– بەڵام دەترسێم ،دەترسێم بەستێنی بۆمن دەشتێکی قاقر بێ دەترسێم لەوێش تەنیا بم. تەنیای تەنیا ،دەترسێم هەتا چاوبردەکا شۆڕەکاتێکی مردوو وچۆڵ وهۆڵ بێ ولەوێش "بەهارە"ی نەبینمەوەو ژیانم هەربێ بەهارە بێ ...

"سۆران "بێدەنگ بوو. دوو تنۆک فرمێسکی لەچاوان خزایە سەرکولمی وەک زەردە گوڵی ژاکاوی . قسەکانی گیان و دڵمی دەکوشی مێشکم دەزرینگایەوە .سەرم سوڕمابوو حەبەسابووم .بەڵام بێدەنگی یەکەی زیاتری ئازار دەدام . هەر چۆنێک بوو توانیم لێی بپرسم:

– چی بووە؟ بۆپێم ناڵێی چت بەسەرهاتووە"بەهارە"چی لێ بەسەرهات ؟

ئاخێکی گیان ولەش تاوێنی هەڵکێشا وگوتی :

ـ خاڵم "پیووت ئاغا"ی باوکی بەزۆر بەشووی دا ..... بۆخۆت دەزانی روسم ودابی عەشیرەتی چۆنە .کچ هەقی دیاری کردنی هاوبەشی ژیانی خۆی نیە .باوکی دای بە پیاوێکی کەبەتەمەن زۆرلە "بەهارە" گەورەتر بوو.

پیاوێکی دزێوی ناشیرنی بەدکار."بەهارە" ئەو"بەهارە"ی کە دەتگوت گوڵی نازەناقەتی نەهێنا . لەسەری داوشێت بوو-

هەموو رۆژێ دەچووە سەرکێوێک لە پەنای گوندەکەیان وچاوی لە دوور دەبڕی لەبەرە خۆیەوە ورتەی دەهات.

کەس نەیدەزانی دەڵێ چی ؟ نەدوکتۆر ودەرمان چارە سەریان کرد ونەدوعا ونووشتە ئاخ ... ئێمە چەندەزاڵمین.. بۆ دەبێ خاڵم بێ بەزەیی یانە ـکا یەبەژیانی کچی خۆی بکا . زۆر جاران لە ژوورێکدا رایاندەگرت ودەرکەیان لە سەری دادەخست . ئەویش مانی دەگرت ودەمی لەهیچ شتێک نەدەدا بەناچاردەرکە-

یان لێ دەکردەوە و"بەهارە"ش ـ وەکوو بیستوومە ـبەئارامی وەک شنە ،بەرەودوندی کێو دەخوشی وئاوڕی نەدەدایەوە . باوکی کچۆڵەیەکی بۆدیاری کردبوو کەلەگەڵی دەرۆیی و ئاگای لێ دەبوو .ماوەیەکی زۆر لەدوندی کێوەکەدا دەمایەوە وچاوی لەدوور دەبڕی وبانگی شێوان بەرەو ماڵ دەبۆوە . تارۆژێک ، بانگی شێوان ،لەجیاتی ئەوەکە بگەرێتەوە، بەرەو رۆژئاوا، بەرەوئەودوور دەستانەی کەگشت رۆژێک چاوی تێ دەبڕی دەڕوا ...کچۆڵە کەزۆرهەوڵ دەدا بیگێڕێتەوە بەڵام ناتوانی ،ناچاربەچاوی پڕ لەئەسرین تەماشای دەکا تا دەبێتە تارمایی یەک ولە نێو تاریک ولێڵ داون دەبێ..

"سۆران" تاوێک بێدەنگ بوو. سیغارێکی دی داگیرساند وئاوای گێڕاوە:

ـ کچۆڵە کەبەگریانەوە هەواڵی رۆیینی "بەهارە" بۆ پیرۆت ئاغا" دێنێتەوە و دەڵێ"بەهارەلە کاتێکدا دەیگوت "هەوار...هاتم..." رۆیی رۆیی ونەگەڕاوە.

"سۆران "فرمێسکی ئەسترِی وئاخێکی گیان ولەش تاوێنی هەڵکێشا وگوتی:

ـ شەوتا رۆژی لێ دەگەڕێن ئاخری تەرمی بێ گیانی دەدۆزنەوەئاخر"بەهارە" هەڵدێرابوو..

بەخۆم نەبوو وێڕای"سۆران" ئەسرینم دەهاتەخوار.

بەزەییم پێدادەهات ."سۆران" نەمابوو ،ئەو"سۆران"ی جاران ئێستا دەریای خەم بوو تەنیایەکی شەمزاوبوو .شیعری شین بوو ..هەڵستا تارەکەی دەستدایە. ناڵەی تاردەریای خەمی ئێمەی وەشەپۆل خست .

دەنگی برینداری"سۆران"تێکە-ڵاوی شەپۆلی خەم.رۆیی بۆدوور ...تەواوی هێزوبڕستی لە گۆرانی "هەوارەیارهەوارە"دا کۆببووە . هەستی گیانی ، مێشکی ، دڵی گشتی ببوو بە هەوارە..لەناکاودەنگەکە بڕا "سۆران "بێدەنگ و تارەکەی خامۆش بوو.... هەرکامیان بەلایەکداکەوتن ... شەپۆلی دەریای خەم تەنیای شەمزاوی منی بەرەو بەستێنی ئاوات وتاسەی برد بوو..."سۆران"راستی دەکرد چاوەڕوانی من بوو تاخەمی بێ پسانەوەی بۆمن بەجێ بهێڵێ وسەکتە بکا....

**پاشماوەی سەروتار**

پویای ما تمامی توان واستعداد خود را برای هرچه مسئولتر ساختن جامعه بکاربندند و از لغزش وکشانیده شدن به مسیرهای انحرافی و کار در مقوله‌های بی ارزش و بعضا" مضر چنانکه درگذشته شاهد آن بوده‌ایم مصون مانند .

عزیزان بیاد دارید که درزمان حاکمیت طاغوت ورژیم شهنشاهی هدفی که از سوی ارگانها ومراکزبه اصطلاح فرهنگی،هنری،تبلیغی وحتی آموزشی دنبال می‌شد، مشغول ساختن اقشار مختلف جامعه بویژه افکار مختلف جامعه بویژه افکار جوان وبا تحرک جامعه واغفال وبی تفاوت ساختن آنان ازسیر سرنوشت سیاسی ،اجتماعی و اقتصادی اجتماع بود .

سرمایه‌گذاری بزرگ رژیم شاه خائن ( بەپیروی ازبرنا- مەهای تعیین شدەاز سوی استکبار جهانی)همەسازمانهای مربوطه دراین راستا جهت بخشیده بود .وبرای تحقیق این مقصود ،باتوجه به اهمیت بسیار زیاد قلم (همچنانکه در شماره‌های قبل ذکر گردید) نقش ویژه‌ای برای قلم‌بدستان قوم منظور شده ، که آثار بسیار زیاد درمقوله‌های اجتماعی ،هنری و ... که در آنها بهیچوجه از ارزشهای انسانی ،اخلاقی وخودآگاهی فردی واجتماعی ،ارزیابی و نقد واقعگرایانه‌ماوقع و .... خبری نبوده است ، شاهد صادق این مدعاست .

باظهور انقلاب اسلامی در کشور وموج فزاینده آگاهی وبیداری ،ریشه‌های این شجره خبیثه از ریشه بازماند (هر چندکه ازبین نرفت )وعلیرغم برخی انحرافات قلمی ناشی از تحزب که عمدتا" برمبنای احساسات وفقدان دانش وخود آگاهی ودیگرشناسی کافی ونیز تلاشهای مخفیانه‌متضررین ازانقلاب ،حرکت قلم جامعه جهت مثبت یافت .لیک ازآنجا که اساسا" عناصر قابلیت و فاعلیت وعلت عمده آن بکلی منتفی نشده ،دگربار ،دستاویز دشمن گشته وباردیگر شاهد تلاشهای محافل وابسته به ابرقدرتهای جهانخواردر مسیر احیاء فرهنگ وابسته ،تربیت نسلی خواب‌آلود وبی خبر، و افکاری خودباخته وخودکم‌بینی وهویتهای تسلیم‌پذیر ومنظلم هستیم ،که وجود برخی از تمنیات ونیز گرایشات بوالهوسانه سیاسی ،اجتماعی ورفاهی باب مساعدت‌را برای عوامل بیگانه باز وچراغ سبز را برای نفوذشان سبزمینماید.

اکنون بااین حساب قاطبه اهل قلم باید با تاسی از وجدانی بیدارو خاطری هشیار برای ایفای نقش تار- یخ ساز خود قیام کنند و راه رابرنااهل ببندند . قلم بدست‌گرفتن ونوشتن کارآسانی است ،آنچه مایه امتیاز است اثبات‌ثمر است‌و نشستن بر مسندرهبری وهدایت‌است .

بدین لحاظ بایدبر تعیین ملاک وتشخیص میزان همت‌کرد و تمیز صواب ازناصواب‌را بر همگان ممکن ساخت .

مسئله مسئولیت‌آفرینی که در شماره قبل از آن سخن رفت‌یکی ازحربه‌های مقابله ومقاومت‌دربرابر سیل بنیان کن بی هویتی است‌که **جهان** استکبار والحاد برای به‌زنجیر کشیدن مستضعفان جهان جاری کرده است . در لزوم این ویژگی پیش از این بحث‌کردیم اکنون وقت‌آن است‌که برخی ازراههای عملی آنرا روشن سازیم .

**واقعگرایی شرط اول :**

هر حرکت مسئولانه ضرورتا "باید واقع گرایانه باشد . حرکت بدون توجه به واقعیات‌کور کورانه ویا خیالپردازانه است ومسئولیت‌زا نخواهد بود. این است‌که نویسنده متعهد باید واقعیات‌را به مردم نمایانده وپرده‌های ابهام و نیز غفلت‌رااز جلوی دیدشان بردارد واین امر خود مشروط ، به واقعگرابودن نویسنده است.

**تطبیق حقیقت با واقعیت (یک بحث‌اصطلاحی )**

اصطلاحا" واقعیات به‌آنچه موجود است‌وحقیقت به‌آنچه

که باید وجود یا بداطلاق میشود با توجه به این فرض منظور از واقعگرایی که پیشتر از آن یاد شد همان حقیقتگرایی است.

اکنون برای حقیقت گرا بودن به چند موضوع نیاز است نخست شناخت حقیقت وشناساندن آن بمردم و در ثانی تبیین واقعیت ونقدو حقیقت بدست آید وباید بسیار دقت داشت که سرسختی بعضی از واقعیتها موجب انطباق حقیقت برواقعیت نشودو مصلحت جوئیهای سازشکارانه حقیقت راقربانی نسازد واین همان امتحان سختی است که مدعیان بسیاری درآن مردود شده‌اند.

**انذار وتبشیر**

مخاطب باید در یک بحث منطقی ومستدل وبه صراحت ویا تلویح (به‌حسب اقتضا) از مخاطرات وخسارتها آگاهی یابد ونسبت به عاقبت دوام، یک واقعیت منفی انذار گردد.

چه‌درغیراینصورت هرگز تحرک وپویایی برای تغییرات اساسی (وحتی تغییرات سطحی) ایجاد نخواهد شد. بنابراین انذار شرایط لازم برای مجاهده وانجام رسالت است.

نکته مهمی که باید دراینجا متذکر شده این است که هر انذاری (هرچنددرضرورتنش تردیدی نباشد) بالقوه میتواند اثر معکوس برجای گذاشته وموجب یاس وانفعال شده وناقض غرض گردد.

برای ممانعت از بروز این اثرمنفی ومخرب (که متاسفانه دربرخی از ادوار، تاریخ جهان و بویژه تاریخ مکتب ومیهنی ما) از عوامل موثر درخمودوجمود و به تبع آن انحطاط بوده‌است) باید با شناخت شرایط زمانی ومکانی ونیز ظرفیت مخاطب به‌گونه‌ای مخاطرات شناسانده شود که ضمن انذار مخاطب انگیزه مبارزه ومقابله دروی ایجاد ومنفذ انفعال مسدود گردد.

راه تحقق این امر آن است که بااستفاده ازروانشناسی فردی واجتماعی، اعتماد به نفس، واعتماد به امکان تغییرشرائط درمخاطبین ایجاد شده وآنگاه باادادن برنامه عملی تدریجا" آنانرا وارد صحنه این پیکار انسانی کرد.

برگردیم به قبل و دوران، انقلاب وبیاد آوریم که‌اعتقاد به "غیرممکن بودن مقابله با دستگاه هزار فامیل پهلوی و ژاندارم منطقه وتغییر نظام" تا چه میزان در رکود جامعه قبل ازانقلاب موثربوده‌وآنگاه که روح مقاومت ومجاهدت در کالبد سردویخ زده جامعه دمیده شد وانگیزه‌های روحی و مصنوعی لازم درمردم ایجاد شد، چه تحول بزرگ وعظیمی راموجب شد. اینستکه بایددر امر انذار نیز بدقت عمل کرد. تا بجای انگیزه‌دادن، حذف انگیزه نشود.

نکته بعدی آنست که چگونه انگیزه راایجاد کرده و یا قوت بخشیم؟

برای اینکار باید جامعه را به وصول به اهداف متعالی ومقدس که هرروح بشری را جاذب باشد بشارت داد. وبدین ترتیب باامیدبخشی به اقشار آنانرا به انجام رسالت واداء وظیفه تهییج نموده و تمهیدات لازم رایادآور شد. موفقیت دراین کار به میزان بسیار زیادی بستگی به نحوه ترسیم واقعیات منفی وزشت وحقایق زیباو برین دراذهان مخاطبین خواهد شد. در بسیاری ازموارد کار مهم دیگری نیز بایدپیشتر انجام گردد و آن قطع وابستگی های خلطتی (روحی) واجتماعی، اقتصادی وسیاسی مردم به واقعیت منفی است. واین کار محتاج به داشتن تحلیل صحیح از شرایط وبرداشت درست از شخصیت انسان است.

واین همان نقص اساسی و مهمترین عامل شکست استکبار شرق وغرب درمقابله با موج توفنده این مردم است.

ادامه دارد

یەکەم ـ لایەنی (دەروونی) رومانتیزم و دەست تێوەردانی هەست و نەستی خودی شاعێر بۆ کێشانی وێنەی جیهانی دەرەوە. دووەم ـ زاڵ بوونی خەیاڵ بەسەر واقیعیەتدا، ریالیزم ئەو دوولایەنەی تێک شکاند و وەلای نان. واتا ریالیزم، بە سەرکەوتنی حەقیقەت بەسەر خەیاڵدا دەژمێردرێ، گرنگی ئەم قوتابخانەیەش زیاتر لەوەدا دەردەکەوێ کە هەموو ئەو قوتابخانانەی دوای وی لەجیهاندا هاتنە کایەوە نەیانتوانی لە نرخ و ئیعتیباری وی کەم بکەنەوە و ئەورۆ بەبناغەی ئەدەب و هونەری نویی جیهان دادەنرێ.

کەواتە ریالیزم بریتیە لە "نیشاندانی ژیان بەو شێوەی کە لەواقیعدا هەیە". بەڵام نە ژیان و نە واقیعیەت هیچ کامیان سادە و یەک لایەنە نین. ژیان و واقیعیەت هەر دووکیان لەوەی دەدیترێن و هەست پێ دەگرین قووڵتر وپێچاوپێچترن. بۆیە ریالیزم بەتوێکلی دەرەوە و بەوەی کە بەچاو دەدیترێ رازی نابێ، بەڵکوو هەمیشە هەل و مەرجی کۆمەڵایەتی لەبەر چاو دەگرێ، بۆ نموونە هەموو کەس پاک وخاوێنی پێ خۆشە و بەلایەوە شتێکی باشە و پیس و پۆخڵیشی بەلاوە شتێکی خراپە و رقی لێی دەبێتەوە، جا ئەگەر شاعێر هەروا بەسادەیی بڕوانی دەبینێ هەمیشە سەرمایەداران پاک و خاوێن و بۆن ـ خۆش و خۆش سەلیقەن، هەژارانیش دەست قڵێشا و تۆزاوی و عارەقاوین. بەڵام شاعێر یا نووسەری ریالیست سەرەتا هەوڵ دەداتێ بگا کە بۆچی پیاوی دەوڵەمەند خاوێن و خۆش سەلیقەیە و پیاوی هەژاریش دەست قڵێشاو و تۆزاوی و عارەقاویە، و ئەگەر گەیشتە راستەقینە هەمووشتێکی بۆ روون دەبێتەوە ئیدی پیس و پۆخڵی هەژاران مایەی نەفرەت و بێز لێبوونەوە نابێ، بەڵکوو هەستی هاودەردی بۆلای خۆی رادەکێشێ وهەروا خاوێنی رادەکێشی و هەروا خاوێنی و خۆش سەلیقەیی سەرمایەدارانیش لەحیاتی دڵ خۆش کردن دەبێتە مایەی رق و تووڕەیی و نەفرەت.

لێرەدا تەنها بۆ نموونە کوپلەیەک لە شێعرێکی گۆران دێنینەوە بزانین چ ریالیستیەکی تێدا بەدی دەکەین:

**من ئەو دیلەم ئامانجم قیبلەی گشتە**
**با سامدار بێ و پڕ درک بێ رێی راستم**
**مادام هێزی زوربەی گەلم لە پشتە**
**درک گولە و ترس ئارامە بۆ خواستم**

**شیعری نوێ (شیعری ئازاد):**

هەر سەردەمێکی مێژوویی و هەر بەرەیەکی ئادەمیزاد هونەرێکی تایبەتی و گونجاوی خۆی هەیە، کەجوانی یەکی تایبەتی خۆی پێوەیە و دەلیلی پێویستی ئاوا هونەرێک بوونی هەمان هونەرە. ئەو هونەرە تازەیە ئەگەر پێ بگاورەگ دابکوتێ و بەردەوامی هەبێ، دەردەکەوێ کە هەقی مانەوەی هەیەوقۆناغێکی پێویستی پێشکەوتنی هونەرە، خۆ ئەگەر کارەکەش تەنیا تێک دان و سەرلێ شێواندن بێ، دیسان دەتوانین دڵنیا بین کە ئەو تێک دان وسەرلێ شێواوی یەتێک دەشکێ و راپەرینێکی بە دوادا دێ.

کاتێک نێوی شێعری نوێ دێتەگۆڕێ، بەلای هێندێکەوە تاکە پێوانە بۆ جوێ کردنەوەی کۆن و نوێ لە یەکدی بوونی کێش وقافیەیەکی رێک وپێک ونەبوونیەتی، بەڵام لە راستیدا ئێمە هەرگیز ناتوانین بەوەندە قسەیە شێعری نوێ بناسین و حوکمی بەسەردا بدەین، چونکە چەندان رێبازوسەبکی جۆربەجور لەنێو ئەو شێوە نوێیەدا خۆیان دەنوێنن.

هەروا ئەگەر بمانەوێ سەبکی ئەورۆی شێعری کوردی دیاری بکەین، دیسان ناتوانین بە ئاسانی بگەینە ئەنجامێک، چونکە لە کاتێکدا کە هێندێک پابەندی کۆنترین شێوە و رێبازی ئەدەبین و شۆڕەیەکیان بە دەوری خۆیاندا کیشاوە و رازی نابن هیچ گۆڕانێک۔ لەو شورەیەوە ئاوای سنووریان بێ،

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەدەبی واقیعی،شیعری واقیعی ،جگە لە شێوەی ریالیزم هیچ ریبازو شێوەیەکی دیکەنیە . دیارەناتوانین بلیین شێوەوریبازەکانی دیکەئەدەب نین،بەلکوو بە پێچەوانەوە ئەدەبن و هەریەکەشیان پێویستی سەردەمی خۆیان بوون ،تەنانەت ئەو ئەدەبانەشکە هیچ ئامانجێکی مرۆڤایەتی یان نیە هەر ئەدەبن ،هەر وەکوو چۆن دروست ـ کردنی بۆمبی ئەتۆمی عیلمە بەلام عیلمێکی دژی ئینسانی‌یەکە لەدژایەتی یەکومەلایەتی و ئابووری‌یەکان‌پەیدا دەبێ.عیلم لە پێناوی

عیلمدا هیچ مانایەکی نیە .چونکە ئامانجی عیلم چاککردنی ژیان وکامەرانی وخۆشبەختی ئینسانە .هەروا "هونەر لەپێناوی هەنەر"یشدا جگە لە وەهم وخەیالێکی پووچ و بێمانا هیچی دیکە نیە .ئەدەب و هونەرێک کە تەنیا لە پێناوی خودی ئەدەب و هونەردا هاتبێتە کایەوە ناتەواوە،چونکە فەرمانی ئەدەب و هونەر بەهێزکردن و پاراوکردنی رووحی ئینسان و پەرەپێدانی نێوەرۆکی بیر و بێدار کردنیەتی .

هونەر لە سەراسەری مێژوودا ،دۆستی بەوەفای ئینسان بووە، و شان بەشان لەگەڵ پێشکەوتن و کامڵ بوونی بیری مرۆڤ پێشرەوی کردووەو هەربۆیە هونەر هەرگیز بۆ سەرگەرم ـ کردن و پڕکردنەوەی کاتی بێکاری نیە بەڵکوو فەرمانی هونەر نیشاندانی واقیع و ژیانی راستەقینە و و ناساندنی شتە ون و نادیارە ـ کانە بە ئینسان .

هێندێکی دیکە گوێ قوڵاغی بچووکترین گۆڕانی لە ئەدەبی بێگانەدا کە زوربەیان تەنیا رەنگدانەوەی سەرلێشێواوی و ژیانی نالەبار و کێشەی لەبن نەهاتووی شارستانیەتی رۆژئاوان ، کە لە ترس و نائومێدی و رەش‌بینی و بێ‌هیوایی زیاتر چی دیکەیان تێدا بەدی ناکرێ.یان هێندێکیان تەنیا بریتین لە نێوەرۆکێکی پووچ و بێمانا کە لە چوارچێوەیەکی پێک هاتوو لەچەند ووشەی بریقەدار دارێژراون و دیارە لە پاڵ ئەوانەدا ئەدەبێکی نوێی رەسەنیش هەیە کە هەڵقوڵاوی ژیان و هەل و مەرجی واقیعی ئێستامانە، کە ئێمە لەم کورتە باسەدا دەمانەوێ بزانین ئەو ئەدەبە رەسەنە کامەیە و بەواتایەکی روون تر و تایبەتی‌تر بڵێین شیعری نوێی رەسەن کامەیە...؟

شیعری نوێی رەسەن ئەو شیعرەیەکە رەنگدانەوەی ژیانی واقیعی کۆمەلگای‌خۆمان بێ و لە هەمان‌کاتیشدا شان‌بەشانی ئەو کاروانە مەزنە بڕوا کە لە جیهاندا لەرێ دایە چونکە رەسەنی لە گۆشەگیری و دوورە ـ پەرێزی و چوونە نێو چواردیوارێکی تەسکدا نیە کە بێئاگا بین و نەزانین لەو جیهانە گەورەیەدا چی روودەدا .رەسەنی لەوە دایە کە بێ بیرتەنگی و"تعصب"ی کوێرانە هەمیشە پردێک لەنێوان فەرهەنگی ئێمە و فەرهەنگی ئێمە و فەرهەنگی میللەتانی دنیادا هەبێ ، بێ ئەوەش کە خۆمان لەبیر بچێتەوە.

شیعری نوێی رەسەن ئەو شیعرەیە کە شتێکی نوێ بێنێتە کایەوە و ئەوەی کە تا ئێستا نەناسراوە بە خەڵکی بناسێنێ نەک ئەوانەی کە لە گوێی خەڵکیدا ساوون یا ئەو شتانەی کە خۆی ئامادە کراون هەروا بە ئامادەکراوی شاعیر بیانجوێتەوە ودەرخواردی خەڵکیان بدا.

شیعری نوێی رەسەن ئەو شیعرەیەکە لەجیاتی خۆحەریک کردن بەشتی لاوەکی و بچووک و

بڕوانە لاپەڕەی ٤٥

## مەتەڵ

هەتەڵ مەتەڵ مەتۆزی
مانگای حەسەن گەڵۆزی
شەوێ دەنوێ و دەتۆزی
نە گەڵی هەیە نەگوان
شیری دەدا بە هەموان
"مێش هەنگوین"

هەنووکە و مەنووکە
لێی دەبارێ بەفرووکە
"هێڵەگ"

ئەو لای دیوار
ئەو لای دیوار
تێی دایە سەگێکی هار
"زار"

ئەولای پەرژین
ئەولای پەرژین
تێدا دووکۆتری نەخشین
"چاو"

هەرکە نووسا پێتەوە
تازە لێت نابێتەوە
"ناو"

# پەندی پێشینیان

● سوار هەتا نەگلێ نابێتە سوار
● چەم بێ چەقەڵ نابێ .
● دەستێک بەتەنێ تەقەی نایە
● ئاسنی سارد بەفوو گەرم نابێ
● هەموو کەس بکا دەنگێ
ئەتۆ بچۆوە بن بێژینگێ
● زۆرە ملی ، مل شکانی لە دوایە
● گیا بە دمی مەری خۆش بێ .
● شایەدی رێوی کلکە .
● ئەگەر تۆ رێوی من کلکم .
● پشیلە دەمی ناگاتە بەز دەڵێ ترشە
● کوێر چی دەوێ دوو چاوی ساخ
● بانێک و دوو هەوا .
● کوتەک دەزانێ قۆناخ لە کوێ یە
● کۆسە چوو بۆ ردێنی سمێڵیشی لە سەردانا
● شوێنی شێرە ورێوی گێرەی تێدا دەکا
● هەمووکەس عەرزی نەرمی پێ دەکێڵدرێ
● گوێلکی خۆماڵی قەت بە گا ناشێ
● باشێر بتخوا پەنا بۆ رێوی مەبە
● ماری نێو خۆ لە پۆتینێ
سەبر پێوە دەدا زۆر دێشێنێ

● ئاقا روویا پەشکەکە ،ئەگەر رژیا مەشکەکە.
● ئاف کوسەر سەرێ مرۆڤ کەت ، ج بهۆستەک،چ چار تلی.
● ئاف گۆلا دابمینە ،گەنی دبە .
● ئاف تێکەڤە جیهێ تەنگ،دەنگ ددە .
● ئاف دزانە بناڤی ل کویە .
● ئاقا خاستی‌یا ،نا چەهەستی یا.
● ئاقا بچووک ماسییا بچووک ، ئاقا مەزن، ماسییا مەزن.
● ئاف ری یا خۆ ڤە دکە .
● ئاقا خور تا سەرئەڤراز دچە .
● ئاف دچە ،خیز دمینە .
● ئاف و ئاگر بێ ئەمانن .
● ئاقا کۆ ئاڤەروویێ دبە ڤەنەخۆ.
● ئاقا رژد (پیل)نەترسە ، ئاقا مەند (لەم)بترسە .
● ئاقاتیا گوندا ، بەراتییاری یاڤە کفشە .
● ئاقا کو بیهانی بۆ مرۆڤ بینە شێلوویە .
● ئاف بەرب ئاقایا دچە .
● ئاف تم سەر بەر ژێر دچە .
● ئاڤێ ئاش بریبە ،ئاشوان ل دوو چەقچەقوکێ کەتیبە .
● ئاقا رژیایی بەرەڤ نابە .
● ئاف ژ "نێروانێ" فەیدە ل "تاقیانێ".
● ئاڤێد گۆلە گەنی‌یا بێ رەق و بەق نابن .

لێرەدا سپاسی کاک ئەحمەدی بەحری وکاک ج.م. شەمزاو، کاک ئازاد عیسا-خوشکە نازداری غەفووری خوشکە ئەختەری شیخ الاسلامی کاک رەحمانی حاجی کاک خدری رەحمانی کاک ئاوارەمحەممەدیان کاک سەیدئیسماعیلی سەید شوکری دەکەین کەبۆرازاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتی‌یان داوین . خوائاگاداریان بێ .

جارێک کابرایەک کوڵێکە چینی پێ دەبێ . لە نێو بازار تووشی سوفی یەکی دۆستی دێ کە گۆچانێکی بە دەستەوە ،

سۆفی دوای چاک و خۆشی گۆچانەکەی راست دەکاتەوە و بە هەموو دەمای خۆی لە کوڵە چینی کابرا دەدا و دەڵێ: ئەی ئەوە چیە پێتە ؟

کابراش دەڵێ : ئەگەر گۆچانێکی دیکەی لێدەی هیچ!!

" ئاوارە محەممەدیان "

**ـ سەعاتێکم هەبوو حەوت ساڵان لە چاڵدا بوو. کە هێنامەدەر پاش و پێشی نەبوو .**

**ـ جا ئەوە چیە! باوکم لە چاڵ کەوت دوای حەوت ساڵ هاتەدەر. هەر زیندوو بوو**

**ـ باشە بابت لەوێدا چیدەکرد**

**ـ سەعاتی بابی تۆی قورمیش دەکرد .**

پیاوێکی فەقیر جارێک دەچێ وێنجەی ئاغا دەدزێ ولە سەر گیشەی دادەنێ و دووسێ باقە وێنجەی بە سەر دادەدا. ئاغا پێدەزانی و وەدوای وێنجەکەی دەکەوێ. لەو دەمەدا دەگاتە سەر گیشەی کابرای فەقیر. دەبینێ بزنەکوڵەیەک سەری دەباتە نێو نیشە و هێندێک وێنجەی تەڕ دەردێنێ . ئاغا دەڵێ

ـ کوڕە کابرا ئەو وێنجەت بۆ دزیوە؟

کابرا دەڵێ.

ـ ئاغا من چۆن دزی لە تۆ دەکەم ئەوە باهێناویەتی

ئاغا دەڵێ

ـ ئەدی چۆنی بردۆتە ئەوبنە!

کابرا دەڵێ:

ـ جا چووزانم کاری خۆیەتی چۆنی عەرزو ئاسمان دروستکردووە ئاواشی ئەم وێنجە بردۆتە ئەو بنە !!

کابرایەکی جووتێر چای لێ دەنێ .شارەیی یەک بەوێدا رادەبرێ .کابرا خولقی دەکا شارەیی دێ و لە چایەکە دەخواتەوەودەڵێ :

**ـ بێ قەیدی بەچئاوێکت ئەم چایە لێناوە ؟**

**ـ بە ئاوی چۆمی**

**ـ ئاوی چۆمی میکرۆبی هەیە**

ـ میکرۆن چیە ؟

**ـ شتێکی زۆر وردە بە چاونابیندرێ . پیاوی نەخۆش دەکا .**

**ـ ماڵت خرانەبێ ئەوە دەڵێی چی ؟ ئاوی ئەم چۆمە کەڵی دەبا چ بگا بەمیکرۆنە چکۆڵەکەی تۆ !!**

**ئاسۆیی (١ – ١٥):**

١ـ نووسەری عالەم ئارای عەبباسی کە بەوردی باسی کارەساتی قەڵای دمدمی کردووە وخوالی خۆشبوو مامۆستا هێمن کردوویە بەکوردی ـ تەرایی ٢ـ بەڵاونەگبەتی ـگیا یەکی سێ پەلکە ٣ـ داخواز ـ وەختوزەمان ـ ئەسپیان بێ دەرازاندەوە ٤ ـ پێشگرێکە بۆ هیندێک فیعل ـ پسپۆرو شارەزای هەرکارێک ـ مەقالە ٥ ـ دووکارکەزەمانیان یەک بێ ـ شارێک لەکوردستانی عێراقدا ٦ ـ تووک ـ لەوسەرەهەورازە ـ نەخۆشی یەکی ئەسپ ـ هاری بێ لاق ٧ ـ خانووبەرەوزەوی وزار ـ دەریاچەیەک لەکوردستان ٨ـ فێنکە با ـ "لیکەن"ی تێکەڵاو ـ خوری هەورامان ـ خوشکە مێرد ٩ـ ناوچەیەک لەشارستانی سەقز ـ بەریوانی ١٠ـ قەفەز ـ وانێک ـ قسە ـ ربەی سەرەو نخوون ١١ـ بنۆس وسەبەب ـ دەفروئامانیشی لێ سازدەکرێ ـ دۆستی مێخەک ـ پەژارە ١٢ ـ لووس ـ گیان ـ سپاسی بێگانە ١٣ـ سەرگەردان ـ برای خاتووزین ١٤ ـ راوچی ـ زەمانێک ـ ناوی نەوتبوو .... ١٥ ـ دارستانی پڕ مەکۆی ئەوین ـ ئاواشهەرلووتە ـ هێوەر ـ

**ستوونی (١ – ١٥):**

١ـ چەشنە کوودێک بەم ناوەهەیە ـ گیا یەکی بەهاری ٢ ـ بێڵا ـ پیتەختی قیبرس ـ٣ـ ژاک گوندێک لەناوچەی خورخورەی سەقز ـ گنجی دەم وچاو ـ ٤ ـ بەشێکی گرینگ لەئابووری وڵاتەکە بلێسەی ئاور ـ کپ وبێ دەنگ ٥ ـ هۆزی دوابڕاو ـ نیشانەی جەمعی فارسی ـ بەقەولی مامۆستا "خال" کلکەسووتەکە ـ ٦ ـ خەوتن ـ تازە ـ شێوی دووبارە ٧ـ زار ـ گوندێک لەناوچەی بانە ئەوبەرەی شاخ گەسێبەری لێدابێ ـ ٨ ـ ناوچەیەک لەکوردستانی تورکیا ١١ـ لا ـ گرانترین بار. ٩ـ خێڵ ـ ڕیگای تورکی ـ تۆبەزاراوەی کوردی شیمال ـ ١٠ ـ زیندوو ـ بێ جل وبەرگ ـ وڵاتێک ئورووپایی ١١ـ گوندێک لە دەوروبەری شنۆ ـ شاعیری بەناوبانگی کوردودۆستی نزیکی "کاکەجەمـ ناری" ١٢ ـ شایەر ـ ریش ـ ١٣ـ زەوی ـ دیل ـ ١٤ ـ قیمەت ـ شاخ وکێو ـ پەیمان ووەفا ـ ١٥ پوور ـ حەیا ـ رەنگێکی بابەت بۆ ئەسپ

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | م | ه | ش | ۆ | ی | ■ | ر | ی | ئ | ن | ی | ح | ۆ | ر | و |
| ٢ | ه | ه | و | ر | ا | م | ا | ن | ■ | ی | و | و | ر | ی | ■ |
| ٣ | ر | ی | ر | د | ■ | ه | ر | ■ | ب | ر | ■ | ش | ه | ر | ع |
| ٤ | ل | ا | م | ■ | ک | ش | ■ | گ | و | ی | ح | ا | ■ | ی | ه |
| ٥ | ه | س | ه | ر | ■ | ن | ب | ل | ■ | ن | ا | و | گ | ■ | ل |
| ٦ | و | ه | ح | ش | ی | ■ | ه | ■ | ق | ه | ت | ■ | ه | ه | ی |
| ٧ | ی | ■ | م | ا | ح | و | ل | ی | ا | ■ | ر | س | ت | ■ | ب |
| ٨ | ت | ه | ۆ | ن | ■ | ر | ه | ■ | ه | ه | و | ی | ر | د | ه |
| ٩ | ا | ■ | ۆ | ه | ت | ی | ■ | ژ | ی | ■ | ز | م | ه | ه | ر |
| ١٠ | و | ر | د | و | خ | ا | س | ■ | ر | و | م | ■ | گ | ر | د |
| ١١ | ه | ا | ■ | ه | و | ■ | ■ | م | ه | ت | ه | ل | و | ک | ه |
| ١٢ | گ | و | ی | ■ | و | ی | ن | ه | ■ | ■ | ه | ■ | ی | ■ | ش |
| ١٣ | ۆ | ■ | ز | ا | ن | ■ | ا | ■ | ف | و | ر | م | ی | ک | ا |
| ١٤ | ز | ی | ان | ■ | ■ | د | و | ر | ■ | ل | ی | ژ | ■ | و | ن |
| ١٥ | ی | ■ | س | ه | ر | م | ا | ی | ت | ی | ر | ی | ژ | ن | ی |

### تێبینی

لەنێو ئەوکەسانەیدا کەپڕکراوەی دروستی ئەم جەدوەلەمان بۆبنێرن بەپێی قورعە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ .جایزەی بەرندەی جەدوەل بریتی یەلە ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروە. بەرەندەی جەدوەلی ژمارە ٤ کاک لێزمە بارزان مەلا خالید بوو لەشاری نەغەدەوە

پڕکراوەی جەدوەلی (٤)

پێغەمبەری گەورەی ئیسلام (ص) ساڵی شەشەمی هیجرەت ،لەگەڵ پێنسەد کەس لــە ئەسحابی خۆی بە عەزمی زیارەتی کەعبە ،لە مەدینەوە بەرەو مەککە وەڕێ کەوتن . بەڵام قورەیش کە پێشتر زۆرجاران لەگەڵ لەشکری ئیسلام شەڕیان کردبوو وشکابوون ولە حەزرەتی محەممەد وئەسحابی داخدار بوون ،لە بەرەوەی شاری مەککە ڕێگایان لێگرتن . حەزرەت دە کەسی لە ئەسحابی خۆی کە هەموویان مەزنی قورەیش بوون و لە لای ئەوان زۆریان حورمەت بوو ، بە سەرۆکایەتی عوسمانی کوڕی عەفــان (رض) ناردە مەککە تا قسەیان لەگەڵ بکەن وپێیان بڵێن ڕەسوولی خودا بۆ زیارەت هاتووە نەک بۆ شەڕ ،بەڵام زۆر پێ نەچوو قاسیدێک خەبەری هێنا کە نیووەی ڕاسپاردەکانی ڕەسوولی خودایان لە مەککە کوشتوون . پێغەمبەری خودا بەم کارە کزەی لە جەرگی هات وفەرمووی :

جا ئەگەر وای لێهات تا تۆڵەیان نەستێنم لێرە ناڕۆم، پاشان دارێک لەوێ بوو ، لە نیزیک ئەودارە بەڵێنی لە ئەسحاب وەرگرت کە لەسەر پەیمانی خۆیان بن .هەر دوای ئەم بەیعەتە بوو ڕەسوولی خودا نامەی بۆ خوسرەوپەرویزی شای ئێران وموقەوقەسی والی ئەسکەندەریە و هیرقلی قەیسەری ڕۆم ونەجاشی پادشای حەبەشە نارد وبانگی هێشتن بێنە سەردینی ئیسلام . ئەونامانەی بە مۆری تایبەتی پێغەمبەر ڕازاونەوە ،یەکیان بۆ موقەوقەس بووە کە لەساڵی ١٢٧٥ ی ، کوچیدا لە شاری "ئەخمیم سەعید"ی میسر دۆزراوەتەوە وئێستا لە مووزەی قوستەنتەنیە لە ژوورێکی تایبەتی کە ئاسەواری نەبەوی تێدایە ،ڕاگیراوە.

ئەمەش تەرجەمەی نامەکەی حەزرەتی محەممەد (ص) :

بە ناوی خودای بەخشندە ومیهرەبان ،لە محەممەدی بەندە و ڕەسوولی خوداوە بۆ موقەوقەسی گەورەی قیبت .سڵاو لەو کەسەی ڕێگەی ڕاستی گرتووە ،پاشان بانگت دەهێڵم بۆسەر دینی ئیسلام .ئیسلام بێنە تا بە دوور بی لە بەڵایان ، خودا ئەجری تۆ دووجاران (لەهەر دووک دنیا ) دەداتەوە. دەنا ئەگەر ڕوو وەربگێڕی وەباڵی خەڵکی "قیبت "بە ئەستۆی تۆیە .

ئەی ئەهلی کتێب (قورئان) وەرن با ڕوو لە کەلیمەیەک بکەین کە لەنێو ئێوە و ئێمەدا یەک بێ ،ئەویش ئەمەیە لە خودای مەزن بەدەر کەس نەپەرستین و هیچ شتێک نەهێنینە ڕیزی ئەو و هیچمان جگە لە خودای گەورە ، کەس بە مەزنی خۆ نەزانین .دەنا ئەگەر ڕوو لەم فەرمانە وەردەگێڕن ،بڵێن بە شاهیدبن ئێمە موسڵمانین .

وێنەی نامەی پیرۆزی حەزرەتی محەمەد کوڕی عەبدوڵلا پێغەمبەری ئیسلام بۆ موقەوقەس پادشای قیبت کە لە ساڵی ١٢٧٥ای کۆچی لەشاری ئەخمیم سەعیدی میسر دۆزراوەتەوەو ئێستا وێڕای ئاسەواری نەبەوی لە مووزەی قوستەنتەنیە راگیراوە.